# جەپکێك لە لای لایەی
# دایکانی کورد



رەزا شوان

# ڕەزا شــوان

# چەپکـێک لەلای لایــەی
# دایکــانی کـورد

## لێکۆڵینەوە

ناوی کتێب : چەپکێک لە لای لایەی دایکانی کورد

بابەت :لێکۆڵینەوە

نووسەر : رەزا شوان

دیزاین : روژی للطباعة والنشر

وێنەی بەرگ: هونەرمەند حسین زەندی

چاپ : روژی للطباعة والنشر/ العراق

چاپی : یەکەم 2019

تیراژ : 500 دانە

نرخ: 3000 دینارە

# پێشـەکی

دیمەنێک نییە لە جیهاندا، بگات بە جـوانی دیمەنـی ئەو دایکە کوردە دڵسۆز و دڵۆڤانەی، کە کۆرپەلەکەی کـردۆتە نێو لانــکەکەی و لە پاڵیدا دانیشتووە و بە نەرمـی لانــکەکەی رادەژێـنێت، بە نــاوازێکی شــیرین، بــە دەنگــێکی نەرمـی پــڕ لە ســۆز و خۆشـەویستی، لای لایــەی بــۆ دەکــات و گــۆرانیی بـۆ دەڵــێت، یــا بــە دەنگــێکی غـەمگینی پڕ لە کـسپە و ســۆز، بە جـۆشەوە بـە چـاوانــای پــڕ لە ئەسرینەوە، دەلاوێنـێتەوە، گەرمـەشین دەکـات و کەفـوکـوڵی ســوێی ئاخـی دڵی خـۆی هەڵـدەڕێـژێت و گـلەیی لە بێبەختـی و لە ژیانی پــڕ لە کوێـرەوەری و مەینـەتی و لـە رۆژگــاری دژوار و ناڵەبـار و رەش دەکـات.

سیمفــۆنیایەکی چەنــد بێــوێنەیە، کە نــــاواز و ســەدای لای لایـــەی شیرینی دایـک تێکەڵ دەبێت، لەگەڵ تەقـە تەقی راژەنینـی لانــک و زڕەزڕی پۆیـلە و تەتکە و خڕ هـۆڕی گۆشەگەرە و موتـومـــووڕوو و تەقە تەقــی خـۆلخــولۆکەی قەد داری لانــک و زریــنگە زرینگــی زەنگڵۆکە و خـڕە خـڕی بازنگەکـانی مەچەکە جـوان و ئاسکەکـانیان و خـــرینگە خـــرینگی پلپــلەی خـڕخـاڵەکــانی پێــیە قنجەکـــانیان. کام بۆنی گـرانبەهـا، دەگـاتە بۆنی خۆشی گوڵـەباخ و رێحا نەرمەشـە و جاتـرەی وشکەوەکـرا و حەوت دەرمـانەی نێو حەتحەتۆکەکانی ملی منداڵانی کوردمان؟

کـام نـاوازدانەری بە توانــا و بلیـمەت، دەتــوانێت نــاوازێکی ئەوتــۆ دابنێت کە بگات بـە چێژی نـاوازی سروشـتی لای لایـەی دایکـانی منـداڵانی کوردمـان؟

نەی کام کەلە هـونراوەنووس، وەکوو دایکـانی کوردمـان، یەکسەر ئیلهامی بۆ دێت و دەتوانێت هـونـراوەیەکی شیرینـتر و جوانـتر لە لای لایـە بهۆنێتەوە؟
دیمەنێکـی چەنـد جـوان و سـەرنج راکـێش و هەسـت بـزوێنە، کە دەبینین دایـک کورپەلە جـوان و شیرینەکەی بە سنگیەوە نووسـاندووە و ماچبـارانی دەکـات و دەسـت بە سەریـدا دەهـێنێت؛ وادەزانێت کە هەموو سامـانی جیهان هی ئـەوە، شانـازیش بـە کورپـەلـەکەی و بە ژنـایەتی و بـە دایکـایەتی خۆیـەوە دەکـات.
منـداڵ لە هەناوی دایکیدا دروسـت دەبێت، سـکی دایــکی یەکەمین و پیرۆزتـرین نیشتمانێتی. لە باوەشـی دایکـیدا چاوەکـانی هـەڵدێنـێت، دایکـی بە شـیری پـاکی گۆشـی دەکـا و بە دروسـتی پەروەردەی دەکات. لە سایەی سۆز و خۆشەویستی و نازپێدانی دایکـیدا گـەورە دەبێت و بە نیشتـمانی بەرینی ئـاشـنا دەبێـت.. لـە کـوردەواریدا بـاوە کە منداڵێک لە دایـک دەبێت، پیـرۆزبایی لە دایـک و بـاوکی دەکـەن و پێـیان دەڵـێن:"منـداڵەکەتــان پیـرۆزبێـت و بــە نــازی دایــک و باوکــی گەورەبێــت" راسـتییەکی هاشـاهەڵنەگرە، کە هـیچ کەسـێک ناتوانێت وەکـوو دایـک و بـاوک نــازی منـداڵان هەڵبگـرن و بــەو رادەیـە لە پێناویاندا قـوربانی بـدەن.
لە راستیدا رەمەکی دایکـایەتی زۆر لە رەمەکـی خـودی خۆشەویستی بەهێزترە. پەیـوەندی نێوان منداڵ و دایـک لە لەدایکبوونەوە دەست پێدەکات، لەو کـاتەوە کە دایـک بە نـاوازێکی ناسـک و شــیرین لای لایەی بۆ دەکات و گۆرانی خۆشی بـۆ دەچـرێت. ئـەم پەیـوەندییەش پەیــوەندییەکی ســـۆزدارییە، زیـــاتر لـــەوەی کە پەیوەنــدییەکی پــەروەردەیی بێت.. ئەم لای لایــە و گــۆرانیانەی دایــک، بــەردی بنـاغـەی پەیوەنـدی نێـوان منـداڵ و دایکێـتی.. ئەگـەرچی منـداڵی کـورپە لـە سەرەتاوە لە وشەکان تێناگات، بەڵام چێژ لە سەدا و ئاواز و

موزیکی لای لایه و گۆرانییەکانی دایکی وەردەگرێت، ئێشدەگات کە جێی بایەخپێدانی دایکێتی.
کانگای لای لایه و گۆرانی منداڵان، دڵی پڕ لە سۆز و هەست و خۆشەویستی دایکانه. ئەم لای لایه و لورین و گۆرانییه رەسەنانەی دایکان بۆ کۆرپەکانیان، بایەخ و سوودێکی دەروونی و جەستەیی و پەروەردەیی زۆریان هەیه.
(بیکۆن) دەڵێت:" ئەو گۆرانییانەی کە دایکانمان لەسەر لانکدا بۆمانی دەڵێن، تا مردن لە گوێیەکانماندا دەزرینگێنەوه"
(دیڤد هندی) دەڵێت:" ئەو سەدا و ئاوازانەی کە دایکان لە پێش نووستندا بۆ منداڵەکانیان دەیڵێنەوە، دیاردەیەکی جیهانییە بریتین لەو پەیامە سۆزدارییانەی کە پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوان منداڵان و گەورەکاندا بنیات دەنێن".
رۆڵی دایکان لە پەروەردەکردن و کەسایەتی دروستی منداڵاندا زۆر گرنگه. ئاستی رۆشنبیری و زانیاری و هۆشیاری و دووربینی و بەڵەدی دایکان کاریگەرییەکی ئەرێنییان هەیه لەسەر پەروەردەکردنی دروستی منداڵان. دایکانی رۆشنبیر و دانا، منداڵانی پەروەردە دروست و لێهاتوو پێدەگەیەنن.
چی وتراوه و چی بڵێین لە بارەی دایکانەوه، چەند دڵۆپێکن، لە دەریایەکی قووڵی بێ سنووری سۆز و دڵسۆزی و خۆشەویستی و دڵۆڤانی دایکان.

رەمزا شوان

نەرویج ۲۰۱۸/۱۰/۲۵

# دایک پیرۆزترین بوونەوەرەی دنیایە

دایک پیرۆزترین بوونەوەرە لە دنیادا، لە هەموو سەردەمەکانیشدا دایک پیرۆز بووە و ڕێزێکی زۆر و پایەیەکی تایبەتی لە نێو خێزان و کۆمەڵگادا هەبووە، هەر بە پیرۆزی و شکۆداریش دەمێنێتەوە. دایک سیمبولی ژیانە، چونکە ژیان لە سکی دایکدا لە دایک دەبێت، سکی دایک پیرۆزترین نیشتمانە هەر دایکە درێژە بە ژیان و مان دەدات.. هەرگیز لە دایک بەسۆزتر و دڵسۆزتر و میهرەبانتر و بەخشندەتر نییە.

لە دایک جوانتر و خۆشەویستر و شیرینتر نییە.. دایک وشەیەکی بچووکە و لە چوار پیت پێکهاتووە، بەڵام لە فەرهەنگی زمانی هەموو گەلاندا، دایک جوانترین و شیرینترین وشەیە، دایک لە ناخی دڵماندایە و بۆتە ویردی شیرینی هەمیشەی سەر زمانمان.. دایک وشەیەکە کە گەورەترین واتای لەخۆگرتووە، کە بە هەزاران وشە و ڕستە و نێر و هۆنراوە و چیرۆک و پەخشان و ڕۆمان نایەتە باسکردن. دڵی دایک، زەریایەکی زۆر قووڵ و بێ سنووری سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و دڵۆڤانی و بەخشینە..

دڵی دایک کانییەکی ڕوون و زوڵاڵ و بەخوڕە، کە هەمیشە سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی لێ هەڵدەقوڵێت، نە لێڵ دەبێت و نە وشکیش دەکات.. دایکایەتی بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێی هەموو نافرەتێک دایە، دایکایەتیش سۆزێکی دروستکراو و وەرگیراو نییە، دایکایەتی لێ هەڵقوڵاوێکی خۆنەویستانەیە (لانیرادی) یە.

سـوزی دایـک هێنـده قـووڵ و سروشـتییه بە لای نافـرەتەوه، کە بە هیـچ بەهـایەکی دیـکەی دنیـای ناگـۆڕێتەوە، چونــکە لــە ئەنجـامی دایکایــەتی و کـۆرپــەلە لە بـاوەشکـردنیــدا، ســوز و هەســت و خۆشەویــستییەکی وای لە دڵ دروســت دەبێــت بەو منـــداڵە، کە بە هەمــوو مــاڵی دنیـا ناگــۆڕدرێت. دایـک زۆر میهرەبـانە و هەمیـشە دەبەخشێت و هیچ کاتێکیش چـاوی لە وەرگـرتنی پاداشت نییە.. بۆیـه هەمیــشە گەورەیە لە لامـــان.. هەمیــشە شـــیرینە لە دڵمـــان. (ڤیکتــۆر هۆگــۆ) دەڵێــت:" گــەر هەمــوو جیــهان بچووکــیش بێـتەوە.. دایــک هــەر بــە گەورەیــی دەمێنـێتەوە" هــەر لە بــارەی گەورەیـــــی و شکـــــۆداری و کارتێکــــــردنی دایـــــکەوه (ناپلیۆن) ش دەڵێت:" دایـک بـە دەستی راستی لانـک رادەژێنێت و بە دەسـتی چەپیـشی جیهــان رادەژێنێــت" (جـۆرج برنـادشــۆ) دەڵێـــت:" دایـــک جـــوانی بـــوون و.. روونـــاکی ژیـــانە" شاعـیری نوێخـوازی گـەورەی گەلەکەمــان (لەتیـف هەڵـمەت) دەڵـێت: " نــەی دایــە چەنــد جــوانی نــەی دایــە...... بــە تــۆوه روونــاکە ئەم هەمـوو دنیایــە"

ئەوە دایکمان بوو، پێش ئەوەی چاوەکانمـان هەڵبێنین، بە سنگی گەرم و نەرمی خۆیەوە دەینووسـاندین و بە شیری پـاکی گـۆشی کـردین.. ئـەوە دایکـمان بـوو، کە بە لای لایــە و گـۆرانی و گورگـانە شەوی دەیلاوانــدینەوە و لانکەکانمــانی رادەژەنــی و تــا بەیــانی نێـشکی دەگــرتین.. ئەوە دایکمــان بـوو، کە رۆژی ســەد جـار ماچبـارانی دەکــــردین، رۆژی هـــەزار جـــاریش لە دەورمـــان دەگەڕا و بە قوربانـمان دەبـوو، نزای ئەوەی دەکـرد و لـە یـەزدان دەپـاڕایەوە کە بێــوەی بیــن و مــەرگــی پێــش مەرگــمان بکــەوێت و جــەرگی نەسـووتێت. ئەوە دایکمان بوو، هەموو ناز و نـوزێکی هەڵدەگرتین و

هـەموو ورك و مەهلەمكـانەكانی جێبەجـێ دەكرد، تەنـانەت تـیكەكەی خۆشـی دەكـرد بەدەمـانەوە.. ئـێمە لە پـڕێک نەبـووینە بە كـچ و كـوڕێک، لە سایـەی شەونخـونی و بەرخـودانی دایكمانـدا پێگەیشتین.. ئـەوە دایكمـان بـوو:" بـە لای لایـە و گـۆرانی .... رایژەندووین تا بەیانی ـ فایق بێكەس"

دایک یەكەمین و دلسۆزترین و گەورەترین مامۆستای مندالە، بەلكو دایـک مامۆستای مامۆستاكانە.. هەمیشە حەزدەكـات كە قـوتـابی و نـەوەی بـاش پێبگەیـەنێت.. بـاوەشی دایكیش یەكەمین قوتابخـانەیەی مندالە، لەم قوتابخـانەیەوە فێری گـڕوگاڵ و نەطفـوبێی زمـان و ژیـان دەبێت. شاعیری میسری (حافز ئیبراهیم) لە بارەی رۆڵـی دایكەوە دەڵێت: "دایـک گـەر ئـامادەبـكرێت قـوتـابخـانەیەكە.... گـەلـێكی رەسـەن دێنـێتە كـایـەوە" بـاوەشـی دایـک خـۆشـتـرین هـێلانـەی سـۆز و خۆشەویستییە، نـارامتریـن شوێنـە. بـاوەشی دایـک دەتوانێت جیـهانێكی پـڕ لە هـیوا و سوودی دەگەمەن بـۆ منـداڵ دروست بكـات.. بـاوەشی دایـک دەرمـانێكی هـەرزانی سەیـر و دەگـمەنی ئەوتـۆیە، كە دەتوانێـت چارسـەری زۆربەی نەخۆشـییە دەروونـی و جەستەییەكانی منداڵ بكـات، هیچ دەرمانێـک نییە كـە بتوانێـت شوێـنی بـاوەشی دایـک بگرێتـەوە. (شكسپیر) دەڵێـت:" لە جیهانـدا سەرینـێک نییە، كە لە بـاوەشی دایـک نـەرمتربێت" (ڤۆلتێر) دەڵێت:" تەنیا شـوێن كـە دەتـوانـم سـەرم بخـەمـە سـەری و بـە دڵنیایـی و نـاسـوودەیی لەسـەری بنـووم.. ئـەوە بـاوەشی دایكـمە" (سوكرات) یش دەڵێت:" هەرگیز هەست بە دڵنیایی ناكەم، تەنـیا ئـەو كاتـانە نەبێـت كـە لـە بـاوەشـی دایكـم دام" هـەر دایـكی دڵسۆز و هۆشیارمان بـوو، كە فـێری نەطفـوبێی

"کوردایەتی" و یەکەمین وانەی "کوردستان پەروەری" کردین.. دایکمان فێری گەلی زانست و زانیاری کردین، فێری گەلی بەهای بەرز و پیرۆز و داب و نەریتی رەسەنی کوردەواری و رەفتاری جوان و هەلسوکەوتی نایاب و پرنسیپەکانی رەوشت بەرزی و جوانی کردین. (لامنیە) دەلێت:" ئەوەی کە مندال لە باوەشی دایکیدا فێری دەبێت، هەرگیز ناسڕێتەوە"

(تۆماس ئەدیسۆن ـ داهێنەری کارەبا) دەلێت:" ئەوە دایکم بوو کە دروستی کردم" (جوبران خەلیل جوبران) یش دەلێت:" دایک هەموو شتێکە لە ژیاندا.. دلدەرەوەیە لە ماتەمینیدا.. هیوایە لە بێ ئومێدیدا.. هێزە لە لاوازیدا" هونەرمەند (بنیامین ویست) دەلێت:"ماچێکی دایکم کردمی بە هونەرمەندێکی جیهانی" (جۆن وسلی) دەلێت:" دایکم ئەو کانییەیە.. کە جوانترین پرەنسیپەکانی ژیانمی لێ وەردەگرم" (جۆزێف دی مێنەر) ش دەلێت:" لەسەر ئەژنۆکانی دایک رۆلەکانی نیشتمان پێدەگەن" (ریشارد نیکسون ـ سی و حەوتەمین سەرۆکی ئەمریکا) دەلێت:" دەتوانیت هەموو شتێکم لەبیربەریتەوە.. تەنها ئەوە نەبێت کە دایکم فێری کردووم" (کیم ئیل سونگ) دەلێت:" مرۆڤە نایابەکان هەمیشە ئەوانەن کە لە لایەن دایکانیانەوە بە باشی پەروەردە کراون"

سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و دلسۆزی و دلۆڤانی و بەرخودانی و لێبووردەیی و دلگەورەیی و بەخشندەیی دایک، بوونە بە ئیلهام و بە هەوێنی، سەدان شاکارە هونراوە و چیرۆک و پەخشان و وتار و رۆمان و شانۆ و داستانی چەندین کەلە رۆمانووس و هۆنراوەنووس و چیرۆکنووس و شانۆنووس و وتاربێژ. بۆ نموونەش:

شاکاره رۆمانی "دایک" ی رۆماننووسی رووسی "ماکسیم گۆرگی" (سامۆییل نادەمیز) دەڵێت:" لە ژیانتدا، هەرگیز ناتوانیت خۆشەویستییەکی بلندتر و قووڵتر و پاکتر و راستەقینەتر لە خۆشەویستی دایکت بدۆزیتەوە" رۆڵی باوکیش بە کەم نازانین، بەڵام ئەوە راستییەکی راست و هەڵشاهەڵنەگرە، کە ئەو سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی و دڵۆڤانییەی کە دایک بۆ منداڵەکەی هەیەتی، ئەو رۆڵەی کە دایک لە گۆشکردن و پەروەردەکردنی منداڵدا هەیەتی، بەم رادەیە لە باوکدا نییە و ناتوانێت رۆڵی دایک ببینێت.. ئەم سۆز و بەزەیی و رۆڵەش، لە دایکی هەموو گیانەوەرەکانی تریشدا هەن.. کە سۆزداری و خۆشەویستییەکی رەمەکین. دەشڵێن: "چاکەی باوکان لە بەرزترین لووتکە چیا بەرزترە.. چاکەی دایکانیش لە قووڵترین زەریا قووڵترە"سۆز و خۆشەویستی دایک، زۆر گرنگ و پێویستە، کارتێکردن و رەنگدانەوەیەکی ئەرێنییان لە ژیانی ئەمرۆ و لە داهاتووی منداڵدا هەیە.. سوودێکی زۆریان هەیە بۆ مستەکردنی پێویستییە دەروونی و جەستەیی و هۆشیارییەکانی منداڵ.. ئەو منداڵە بەختەوەرانەی کە لە قۆناغی منداڵییاندا، بەخت یاوەریانە و لەناو شووورەیەکی سۆز و خۆشەویستییدان، مەستی سۆز خۆشەویستی دایک و باوکیانن.. لە داهاتوودا دەبن بە ژنان و بە پیاوانی دروست و هاوسەنگ، سەرکەوتوو دەبن لە ژیانیاندا.

ئەوە پێزانین و رێزلێنان و شایستەیەکی گەورەیە کە" بەهەشت لەژێر پێی دایکانە" تا دایک و باوک گەردەمان نازاد نەکەن و ئەمان بەخشن، ئەو بەهەشتە نابینین.

دایــک هێنــده گەوره و شیرینه، که فەیلەســووفی پــەروەرده (جــان جاک رۆسۆ) دەڵێت:

"گەر جیهــان له چنگێکـدابێت، دایکیـشم له چنگـەکەی تـردا بێـت، دایکم هەڵدەبـژێـرم" دایکـانمان هێنده چاکەیان به سەرەمانەوه هـەیه، گەر به درێـژایی ژیانمـان، خزمەتیان بکەیـن و ستایـشیـان بکەیـن و هۆنـراوه و سـروود و گـۆرانی بەسەریانـدا هەڵبـدەیـن، نەستەمه کـه بتوانـــین، پاداشـــتی ســـۆز و خۆشـەویــستی و دڵـــسۆزی و لێبووردەیـــی و بەخـــشندەیی و مانــدووبوونیان بــدەینەوه.. دایکــان شایەنی زۆر لەمەش زیاترن، شایـەنی ئەوەن که به ئەوپـەڕی رێـز و شــکۆدارییەوه رۆژی دەیــان جــار ســەری رێــز و نوازشـیان بــۆ دانـەوێنــین، بــه ئەوپـەڕی رێـزەوه لــه بەردەمیانــدا بچـەمینــینەوه و تێروپــڕ دەســته جوانەکانییــان مــاچ بکەیـن و داوای لـــێبووردن و بەخشین و گەردن نـازادییان لێبکەین.

# منداڵەکانی ئەمڕۆمان..
# هیوای داهاتووی کوردستانن

منداڵەکانمان گرنگترین و بەنرخترین سامان و سەرمایەی گەلەکەمانن، کە لە سامانی زێڕ و دوڕ و نەوت و گاز و لە هەموو سامانێکی تریش زۆر گرنگتر و بەنرخترن. منداڵەکانمان هیوای داهاتووی کوردستانن.. بەشێکن لە ئەمڕۆمان و هەموو داهاتوومانن.. تۆوی زۆربوون و درێژەدانن بە ژیان و بە ئەمریی گەلەکەمان.

منداڵەکانمان، جگەرگۆشەمانن.. خۆشەویستن و هەردەم لەبەر دڵانمانن.. سۆما و گلێنەکانی چاوەکانمانن.. مایەی خۆشی و گەشی و شادیمانن.. چرای گەشی ماڵانمانن. منداڵەکانمان خەمڕەوێنمانن.. گەر خەم و پەژارە بە قەی چیای هەڵگورد لامان باربێت، بە زەردەخەنەیەکی ناسکیان، بە قاقایەکی شیرینیان، بە قسەیەکی قوتیان، دەتوێتەوە و لە بیرمان دەچێتەوە. ئەو ماڵەی پڕبێت لە منداڵان، پڕدەبێت لە زەردەخەنە و خۆشی.

منداڵەکانمان زۆر جوان و بێوێنەن.. پەرین و فریشتەن.. پەپوولە و چۆلەکەی ئەم بەهەشتەن.. چرۆ و خونچەگوڵن.. ناونگی روون و بریسکەداری سەر گەڵا و گوڵن.

(تۆلستۆی) دەڵێت:"منداڵ لە هەموو سەردەمێکدا، هێمای بێتاوانی و پاکی و خێر و راستی و جوانییە" بێگومان منداڵان سیمبولی

دڵپاکی و بێتاوانی و راستگۆیین. نموەی لـە ناخـی دڵـیان دایە، هـەر نـموەیە کە لەسەر زمانیان دایـە. هیچمان لێنالشارنـموە. (رووبـارد کیلـنگ) دەڵێـت:"جوانـتریـن دیمـەن لەژێـر ئـاسمانـدا، دیمـەنی منداڵێکـە کە پێدەکـەنێـت" (هـۆمیرۆس) دەڵێـت:"تاوەرەکـان جوانی شـارەکـانن.. پاپۆڕەکـان جـوانی دەریـاکـانن.. منداڵانیـش جوانی مـاڵـەکـانن"

جیهـانی منـداڵان، جێهـانێکی پـاک و بێتـەم و بێگـەردە.. جیهـانێکی وەنەوشەیی سەیر و سەمـەرەیە، جیـهـانێکە پـڕە لە خـەیاڵی فـراوان، لە هیوای سەوز و گەش، لە خەونی شـیـرین، لـە حـەز و خـۆزگـە، لە راز و مـراز و نیـازی پـاک.. پـڕە لـە زەردەخـەنە و لە پێکـەنین.. لە بـەزم و رەزم و لە هەڵـبەزین و دابـەزین.. لە یـاری و شـادی و هەڵـپەڕین.

جیهـانی منـداڵان، جێهـانـێکی بـێ درۆ و دەلـەسـە و بـێ فـڕوفێـڵە، بـێ خەڵەتـانـدن و بـێ پێـچ و پەنـایـە، بـێ دووزمـانی و بـێ دووڕوویـیە.. جیهانێکی بێ رق و بوغز و بێ کینە و بێ دڵـڕەقیە، بێ شەڕ و ئـاژاوە و بێ گێچـەڵ و بێ هەڕەشـە و گـوڕەشـەیە، بێ دوژمنـایەتی و بـێ رکەبـەری و بـێ تۆڵـەسەنـدنـەوەیە.. منـداڵان جیهـانێکی زۆر سـادە و ساکـاریان هەیە.. دڵیـان پـڕە لە سـۆز و بەزەیـی و لە ریـز و لە خۆشەویـستی، هەسـتیان لە پـەڕەی گـوڵ پاکـترە. هـەمیـشە بـە زمـانی گـوڵ دەدوێـن و لێبـووردن و ئاشـتیخوازن و دەسـازازێن و بێ جیـاوازی پێکەوە یـاری دەکەن، بە کورتی جیهانی منداڵان لێوان لێوە لە پـاکی و خـۆشـەویستی و هـیوا و ساوێـلکەیی.. هەموو ئەمـانە خەسڵەتـە جـوانـەکانی قۆنـاغـەکـانی منداڵیـیانـن.. هـەچ رەفـتار و هەڵـسوکـەوت و خـوویـەکی

نـاپـەسـەنـد و نەخـوازراویـش فـێربـن، ئـەوانـە لـە گـەورەکـانـەوە فـێریـان دەبـن.

(جـوبران خەلـیل جـوبران) دەڵێـت:"خـۆزگە هەر منـداڵ بوومـایە و قـەت گەورە نەبوومـایە، نـە دووزمـانی دەکـرد و نـە لـۆمـە و نـە رقیشـم لـە کـەس دەبـۆوە"

تەنیـا ئەو کەسـانە دەتـوانن بچـنە نێـو جیهـانی پـاکی منـداڵانەوە، کە دەتـوانن بە زمـانی سـادە و سـاکـار و شـیرینی ئەوان بـدوێـن، لـە خواسـت و خـەون و هیـوا و نیـاز و رازەکـانیان تێبـگەن.. لە دڵپاکی و ساوێـلکەیی و راستگـۆیی و خـۆشبڕوایی ئـەوان تێگەیشتووبن. لە ئاخی هەر مرۆڤێکی راستیشدا، منداڵێک خۆی شاردۆتەوە و حەز بە یـاری دەکات.

بێگومـان خـۆشتـرین و هەستیارتـرین قـۆنـاغی ژیـانی مـرۆڤ، قـۆنـاغی منـداڵیـیە.. بـە تـایبەتیش (قـۆنـاغی بـەرایی منـداڵی) یە. کەسایەتی مـرۆڤ لەم قـۆناغـەدا، رەنگ دەکـات، لەبەر رۆشـنایی ئەم قـۆناغـەدا، پێشبینی ئەوە دەکرێت کە منـداڵانی ئەمڕۆ، لە داهـاتوودا، چ کەسـایەتییەکیان لـێدێتـە کـایـەوە.

دایکـان و باوکـانی خۆشەویـست، مامۆسـتا دڵـسۆزەکـان، بەری ئـازادی لە منـداڵەکـانتان و لە قوتابییەکانتـان مەگـرن، جیهـانی شـیرینیان لـێ تـاڵ مەکەن، بـا بە ئـازادی و بە کـامی دڵیـان چـێژ و خۆشـی لە جیهـانی پاکـیان وەربگـرن.. بـا راکـەن، هەڵبەزنـەوە، پێبکەنن، زاق و زرووق بکـەن، بـە کـامی دڵـیان مەستی یـاری و شـادی و خـۆشی بن.

(کورت ڤـاڵد هـایم) دەڵێت:"سەرلەبەری جیهـان قـەرزاری منداڵن" ئاخـۆ ئێمەی کورد توانیومـانە، ئەو قـەرزەی منداڵەکـانمان ئادابکەین؟

له راستیدا بەشێکی زۆر کەمی ئەم قەرزەمان پێ نەداکراوە.. لەم کورتە نووسینێکی وادا، دا ناتوانین باس لە هۆکارەکانی نەدانەوەی ئەم قەرزەی منداڵە بێئازەکانمان بکەین.

دایکان و باوکانی دڵۆڤان و بەسۆز، مامۆستایانی هێژا و دڵسۆز، ئەی هەموو ئەوانەی هیواخوازی داهاتوویەکی گەشتر و شیاوتر و خۆشترن بۆ کورد و کوردستان. ئەم هیوا و ئاواتەخوازانەمان، بە قسە و بە خۆزگە و بە هەناسەهەڵکێشان نایەنەدی، بەڵکو لە رادەی بەتەنگەوەهاتن و بایەخدانێکی کرداریی جیدیمان بە منداڵانی ئەمڕۆمان دێنەدی.. ئەگەر بێتو منداڵەکانمان بە جوانی گۆش بکەین، بە دڵسۆزی و دروستی پەروەردەیان بکەین، ڕێنمایی راستیان بکەین، وەکوو پێویست بەرەو هیوا و ئامانجە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانمان ئاراستەیان بکەین، بە دڵنیاییەوە لە سایەی ئەم گرنگیی پێدانەمان بە کرداری، بە پەروەردەکردنی دروستی منداڵەکانمان، ئەو داهاتووە و هیوا و خۆزگەکانمان دێنە. بەڵام بە پێچەوانەوە، گەر منداڵەکانی ئەمڕۆمان پشتگوێ بخەین و بە هەندیان نەزانین، ئاوڕیان لێنەدەینەوە و بە سەقەتی گۆش و پەروەردەیان بکەین، یا بیانخەینە دەست چارەنووسێکی نادیار.. دوورنییە کە منداڵەکانمان لاڕێ ببنەوە و مل بە هەڵدێرێکی هەزار بەهەزارەوە بنێن و نوقمی چارەنووسێکی تاریک و رۆژگارێکی رەش و نادیار ببن، بەجارێ لە دەستمان دەردەچن و کۆنترۆڵکردن و راستکردنەوەیان زۆر زەحمەتە. ئەمەش هەرەشەیەکی گەورە و زەنگێکی مەترسیدارە بۆ چارەنووسی داهاتووی گەلەکەمان. دەشبێتە فاکتەرێکی ئەرێنی، بۆ لاوازی و بێدەسەڵاتیمان. ئۆباڵی ناکام و داهاتوویەکی نەخوازراوی وەهاش لە ئەستۆی هەمووومان دایە، هەر هەمووومان لێی بەرپرسین.. پاکانە و پاساو و

خــــۆدزینەوەش لە کەس قـــبووڵ ناکـــرێت. ئەفــرەتیش هەمووەمــان دەگرێتەوە.. مێژووش بەزەیی بە کەسدا نـایەتەوە. کـورد وتەنیش: "لە دوای بـاران کەپەنەک بێسوودە" و " چیش بچێنین.. ئـەوە درووێنە دەکەین".

(ئەلیزابێت مـاخ) دەڵێت:" لە کـاتی ئەنجامـدانی پەروەردەکـردنی منداڵەکـانمانـدا، هەر هـەڵـەیەک بکـەین، دەبێـتە هـۆی ئـۆڕانـدنـی جەنگـێک، کــە لــە پێــناوی داهـاتوویــەکی بـاشتــردا دەستمــان داوەتێ"

(فـریـدیـک دۆگـلاس) دەڵـێت" تـۆوکـردنی تـۆوی هێـز لـە منـداڵەکـانمانـدا.. ئاسـانتـرە لـەوەی کە تیمـاری پیـاوانی رووخـاو بکـەین"

خاتـوو (پێنـیلۆپ) لە پەرتووکەکەیـدا (منـداڵەکان پێـش هـەموو شتێک) زۆر بە تونـدی رەخنەکـانی ناراسـتەی کـارگە و سـیاسەت و یاساکـانی دەوڵەتـەکـان دەکـات، بـەوەی تـا ئێسـتا بـە پلـەی یەکـەم بایەخیان بـە بـەرژەوەنـدییەکـانی منـداڵان نـەداوە.

دەبـــێ ئەوەش لە بەرچـــاوبگرین، کە ئەم منـــداڵە چاوگەشـــانەی ئەمڕۆمان، ئەم چـرۆ گەش و خونچـەگوڵە بۆنخـۆشانەی ئەمـڕۆمان، دەپشکـوون دەبن بە شۆڕە ژنـانی خـان ومـان بە پیـاوانی جوامێری ناوپیاوان، دەبن دایکان و بە باوکـان، دەبن بە سەرکردە و پێشەوا و رابـەر، بە دەسەڵاتـدار و بەڕێوەبـەر، دەبن دادوەر و فەرمانبەر، دەبن بە رۆشنبـــیر و نووســـەر و سیاســـەتمەدار و هونەرمەنـــــد و راگەیانـــدنکار، دەبـــن بە مامۆســـتا و پارێـــزەر و پـزیـــشـک و بە کـارمەنـد و بە کرێـکار، دەبـن بە پێـشـمەرگـەی بــە جـەرگ و قـــارەمان. ئەم منـــداڵانەی ئەمـــڕۆمان دەبـــن بە شۆڕەســـوارانی

کۆڵنەدەری مەیدانی کوردایەتی و مەردایەتی.. دەبنە کوردستان پەروەرانی سەرسەخت.. بە هەڵگران و بە هەڵکەرانی ئاڵای پیرۆزمان، لە هەموو شوێن و بستێکی کوردستانی نیشتمانی شیرینمان، دەبن باڵیۆزی گەلەکەمان و دەنگ و رەنگ و سەنگی کورد و چڵە نێرگزی ئازادیخوازی و ئاشتیخوازیی کوردستان بە هەموو گەلانی جیهان دەگەیەنن.. هەر ئەم منداڵانەی ئەمڕۆمانن، مژدەی رزگارکردنی کوردستان لە داگیرکەران رادەگەیەنن و جاری مافی چارەی خۆنووسینی گەلەکەمان دەدەن.. منداڵەکانمان هیوا و چارەنووسمانن.
لەم روانگەیەوە، پێویستە هەموو ئەم ئامانج و ئەنجامە ئەرێنییانە پێشبینی بکەین و لەبەرچاویان بگرین، ئەهێڵین کار لەکاربترازێت. "چەپڵەش بە دەستێک لێنادرێت" پەروەردەکردنی دروست و پوختی منداڵەکانمان و پێگەیاندنیان، ئەرکی هەموومانە. با دەست لە ناودەست و هاوکاربین، هەمووشمان لەبەری ئەرێنییان سوودمەند دەبین. پشکی زۆری شانازی و پێزانینیش، بۆ دایکان و باوکان و مامۆستاکان دەگەڕێتەوە.

# لانک و بێشکە و
# جۆلانێ و دیلانێ و هەلۆرک

(لانک - لاندک) و (بێشکە) سێ ناوی هاوماناتن، مەبەستێک دەگەیەنن، (هەلۆرک) و (جۆلانێ) و (دیلانێ) ش سێ ناوی ترن. هەموویان شوێنی نووستن و ژێرکردنەوە و نارامی و خۆشی بەخشینن بە منداڵانی کۆرپە. تەنها جۆلانێ و دیلانێ نەبێت کە هەڵدەواسرێن و بۆ هەموو قۆناغەکانی منداڵی بەکاردەهێنرێن. هەندێ جاریش بە پێی کات و شوێنی گونجاو و پێویست بەکارهێنراون و بەکاردەهێنرێن. لانک و بێشکە و هەلۆرک بە نەرمی رادەژێندرێن، بەڵام جۆلانی و دیلانێ بە نەرمی پاڵیان پێوەدەنێن. دایک و منداڵ و لانک و لای لایە چوارینەن.. دەوترێ دایک منداڵەکەی خستوتە نێو لانکەکەی رادەژێنێ و لای لایەی بۆ دەکات.. بە زمانی ئینگلیزی بە لانک دەوترێت (کرادلە) بە زمانی عەرەبیش پێی دەوترێت (الکاروک) یان (المهد).

لانک کەرەستەیەکی رەسەنە، داهێنان و دروستکراوێ تایبەتی گەلی کوردە لە هەموو جیهاندا. مێژووی دروستکردن و بەکارهێنانی لانک لە کوردستان دا، زۆر کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هەزار ساڵ بەر لە ئێستا، تا ئەمڕۆش لانک بایەخ و جوانی و رەسەنایەتی خۆی لەدەست نەداوە و لە زۆربەی ماڵەکانی کوردستان دا، بە تایبەتیش لە ناوایەکاندا هەیە، دایکانی کوردمان بەکاری دەهێنن.. بوونی لانک یا بێشکە لە ماڵاندا، گوزارشتە لە بوونی منداڵ لەو ماڵانەدا، منداڵیش بەرهەمی خێزانییە و مایەی

خۆشــی و شــادییە، هــێمای درێژەدانــە بــە ژیــان و مــان و زۆربـوونی وەچــە و نەتــەوە. لانـک کەرەستەیەکی پیرۆزە، چونکە منــداڵانی ئەمــڕۆی تێــدا دەنــوێ کە هــیوای داهــاتوون. لانـک یەکێکە لەو کەرەستە شێوە جوان و دێرینە کەلەپووریانەی کە مۆزەخانەکــانی کەلەپــووری کوردیــیان لــە کوردســتان دا ڕازانـدوونەتــەوە.. لانـکــۆلەی کــوردی بۆتــە جــێی سەرنــج ڕاکێشانی گەشتیارانی بیانی.. وەکوو دیارییەکی جوان دەیکڕن.

لانــک لە زۆربــەی جــۆری دارەکــان دروســت دەکــرێت، بــە تایبەتیش لە داری (هەنار، هەنجیر، قۆخ، بـی، قـەزوان، گوێـز، تــــوو، بەڕوو) کە ئەم دارانە لە دارســــتانەکان و لە چەمەکــــانی کوردستان دا زۆرن.. ئــەم دارانــە بــڕین و تاشین و چەمـانەوە و نیشکردنیان ئـاسانن بـۆ دروستکــردنی لانــک. شێوەکانی لانــک لەیەکـدەچـن، بەڵام جـوانی و هونەری وەسـتای دەسـت ڕەنگـین و شـارەزایـان پێوە دیارە. هەرچەنـدە بە هۆی پێشـکەوتن و داهێنان و تەکنۆلـۆژیای تازەوە، چەنـدین شـێوەی لانـکی مۆدێـرن هـاتوونـەتە ئـاراوە، بـەڵام شێـوە کلاسیکـییە ڕەسەنـەکـەی لانـکی کـوردی هـەر بـە جـوانی مـاوەتـەوە.

دەشـێ وشـەی (لانـــک) لە (لان) یـا (لانــە) وە وەرگیرابێـت کە بە واتای (شوێنی خـەو) و پشـوودان و حەسـانـەوە دێـت.. دەوتـرێت (لانـەی شێـر) دەوترێـت (لان) یــا (لانــە) یــا (هێـلانە)ی هـەڵـۆ، واتا شوێنی نووستن و حەسـانەوەی شێر، هەڵـۆ. لانکیش شـوێنی نووستنی منداڵی کۆرپەیـە.. دووریش نییە کـە لـە فرمـانی (لال) واتــا (بخــەوە) وە وەرگیرابێـت. بە منــداڵ دەوتــرێ (لال) واتــا (بنـوە). وشەی (لای لایـە) ش بە واتا (بنوە) کە بۆ منداڵان دەکرێت. بـا لێکـدانەوە و ساغکـردنەوەی نــاوی (لانــک) بـۆ شـارەزایان و

پسپۆرانی زمـانی کوردیمان بهێنینەوە، ئەوان ناوی (لانـک) مان بۆ یەکلایی بکەنەوە.

کۆمەڵێـک نـاو و شـتی تـر هەن، کە پەیوەنـدییان بە لانـکەوە هەیە، یـا بەشێکـن لە لانــک، ئەمـانەش: ڕەوارە (پــای لانــک ـ دوو پــای هـەیە).. دوو کەوانە (ئەو دوو دارە چەمـاوە کەوانـەیین، کە لـە ئەمـلا و ئــەولای لانکەکــەدان و بوونــەتە چـوارچــێوەی لانکــەکە و لانکەکەیــان ڕاگرتــووە، هەردوو ســەری خوارەوەیــان بە بــنکەی لانــکەکەوە قــایم کــراون و ســەرە کەوانییەکـانیــشیان بە داری دەسـرازەی لانـکەکەوە قایـم کـراون.. کـەمـەی لانـک (ئـەو دارە ڕاستە ئەخـشـێنراوەیە کە دوو کەوانــەکەی پێـوە قـایـم کــراون و دەسـرازەی پێوە دەپـێچن و منـداڵەکە کـورپەکەی بە لانـکەکەوە پـێ دەبەستن.. گۆشەگەر (یا گۆشەگـر یـا گۆشـگوور: جـاران بە شـێوەی تەزبیح لە تـوێکڵی ماسی/ ماسیلکە یـا ـ سەدەف ـ بە ڕەنگـی سپی و شـین دروست دەکـرا و بە گۆشـەیەکی داری لانـکەوە هەڵـدەواسـرا و بە جوولانـەوە و ڕاژەنـدنی لانکەکە خڕەخڕێکی ئەرمـی لێوەدەهـات، منداڵیان پێ ژێردەکردە و یاریی پێ دەکرد، بۆ مەبەستی چاوەزاریش بەکاریـان دەهێنـا، تـا منـداڵەکەیان بە چـاوەوە نەبێـت، بەمەیـان دەوت گـۆشگـرە. دەشـێتیش ناوەکــەی لــە وشــەی گـۆشــەوە هــاتووبێت، چونکە بە گۆشەیەکی لانکـدا هەڵدەواسرا، یا لە قوماتی منداڵی کورپە قایمیان دەکرد بۆ چاوەزار) هەر بە دار دەسرازەکەوە مووروویی پێ هەڵدەواسن. دەسرازە منـداڵەکەی لە لانکەکەدا پێ دەپێچن بـۆ ئەوەی بەرنەبێـتەوە.. بەرلانــکە (ئەو کووتــاڵە ئەخـشـێنراوەیە کە بە زۆری بلـووری سـپی بـوو، بـۆ جـوانی بە دەوری چێوەی بـنکەی لانـکـدا دەیانبەســت).. بلـوێر نـامرازی میزکــردنە، لە شـێوەی پیتــی ئێڵــی ئینگلیزی دایە و ناوەکەی هەڵکۆڵراوە و بۆشە، کونی سەری بلوێـری

کـوڕ و کــچ کەمێـک جیاوازییـــان هـــەیە، بلوێــریش بــۆ ئەوە بەکاردەهـێنرێت بـۆ ئـەوەی مـیـزی منـداڵەکە دۆشەکـەڵەکەی نـــاو لانکەکەی تەڕنەکـات.. ناوەخانە قوتوویەکە یا کیسەیەکی نـایلۆنە، لەبن لانکدا لە ئاستی کونی خوارەوەی بلوێر دادەنرێت بۆ ئەوەی مـیزی منـداڵەکەی تێ بچێت و نـەڕژێتە سەر قـاڵی و ڕاخـراودا.. نێولانکە ئەو دۆشـەکەڵە نەرمەیە کە لە نـــاو لانکەکـــەدا دای دەنـێن، کە لای خوارەوەیــدا کـونێکی تێـیە بــۆ بلوێــرەکە.. سـەرین، کە لە پەڕی پەلەوەر یـا لە لـــۆکە دروسـتـی دەکەن، سـەری منـداڵەکــە دەکــەنە سـەری.. سەرچاوەکـە، ئـەو کووتــاڵە تەنـک و نەرمـەیە کە بەسـەر منـداڵەکەیـدا دەدەن، بـۆ ئـەوەی مێـش و مێـشوولە پێـوەی نـەدەن.. سەرلانـکە، پارچـە کووتـاڵـێکی نـە تەنـک و نـە ئەسـتوورە بەسـەر لانـکەکەیــدا دەدەن، بـۆ ئــەوەی تاریــک بــێت و منــداڵ خــەوی لێیکەوێــــت، یــــا بــــۆ ئــــەوەی ســــەرمای نەبێــــت. گەڵێــک بــابەت و کەرســـتەی ڕەنگـــاوڕەنگیش، بــۆ جــوانی و ڕازانـــدنەوەی لانـــک، وەکـــوو: گوڵـــێنگەی ڕەنگـاوڕەنـــگ، زەنگـلۆکە، موتـومـوورووی ڕەنگـاوڕەنـگ، گوشـەگـر بـە داری دەسرازەی لانـکدا هەڵیان دەواسن، منداڵانی کـۆرپە لە ڕەنـگ و لـە دەنگەکـانی ئـەم شتانە چـێژ و خۆشـییان لێـوەردەگرن و یارییـان پێدەکەن و ئاشنای دەنـگ و ڕەنگیـان دەبـن. وەستای دروسـتکردنی لانکیش بە چەنـدین ڕەنگـی جـوان، داری دەسـرازەی لانـک بـۆیە دەکات. لە هەمـوو شـار و شارۆچکەکـانی کوردسـتان دا، لانـک و بێشکە دروســت دەکرێن و وەستایانی دەست ڕەنگین کردوویانە بە پیشەیان و بژێـوی ژیانیانی پێ دابین دەکـەن. بە تایبەتـیش لە شـاری (کەرکـــووک)ی کـوردســتــانی دا، هـــەر لـــە کۆنـــەوە بـــە دروستکـردنی بێشکە و لانـکی کوردی و قـاپقـاپی دار بەناوبانــگە، لـە شـارەکانی تـری کوردسـتانەوە دەهـاتن لە کەرکووک لانکـیان

دەکری. تا ئەمڕۆش لەم شارەدا کەسانێکی دەست ڕەنگین هەن کە ئەم پیشەیان لە باوکانیانەوە بۆ ماوەتەوە، درێژەی پێدەدەن و لانک و بێشکە بۆ منداڵانی کۆرپە دروست دەکەن، لانکۆلەی قەچ و جوان و ڕەنگینیش بۆ کچۆلەکان دروست دەکەن، یارییان پێدەکەن و بووکە شووشە جوانەکانیان دەخەنە ناویان. ئەگەرچی بازاڕی فرۆشتن و کڕینی لانک گەرم و گوڕی جارانی نەماوە، بەڵام هێشتا حەزلێکەری لانک هەیە. هەندێ لە دایکانی کوردمان حەزدەکەن لانک وەکوو هێمایەکی ڕەسەنی کوردی لە ماڵەکانیاندا هەبێت.. گەر بەکاریشی نەهێنن.

بە ڕێی هەندێ لە کوردانی تاراوگە و ئەو گەشتیارانەی کە گەشتیان بۆ کوردستان کردوون (لانکۆلە)ی کوردییان کڕیوون، وەکوو دیارییەکی زۆر جوان و یادگارییەک لە کوردستانەوە، بردوویانەتەوە بۆ ئەورووپا و بۆ ئەمریکا.

گەرچی لانک و بێشکە، ئەم دووناوە کوردییە لە جێی یەکتری بەکاریان دەهێنین و وەک ئەوەی کە دوو ناوبن بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام لە شێوەدا کەمێک جیاوازیان لەگەڵ یەکتریدا هەیە (بێشکە) کەمێک لە لانک گەورەتر و فراوانترە، پاڵی پێوەدەنرێت و تەقەی نایات. ڕاژەنین بۆ بێشکەش بەکاردەهێنرێت. بێشکە ناوێکی کوردییە، تورک ئەم ناوەی لە زمانی کوردییەوە وەرگرتووە و تا ئەمڕۆش ئەم ناوە بەکاردەهێنن.

حەزدەکەم دەربارەی لانکی کوردیمان، نووسینێکی نووسەری ناسراوی کوردمان دکتۆر (جەمشید ئیبراهیم) کە کوردێکی هاووڵاتی ئەڵمانیایە، بۆتانی باس بکەم، کە لە بەرواری(١٥ی/ئاوگوست/ ٢٠١٢) دا بە زمانی عەرەبی لە سایتی (الحوار المتمدن) دا، لەژێر ناوی (لانک - مهد الطفل

الكردي) دا بڵاوی کردۆتەوە.. پێم جوانە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەم بابەتەمان لەسەر لانکی کوردی، دەقی نووسینەکەی دکتۆر جەمشید وەرگێڕم بۆ سەر زمانی کوردی، ئەمەش دەقی ئەو نووسینەیەتی دەربارەی لانک: "لانکی منداڵی کۆرپەی کورد، بە هەموو جۆر و رەنگەکانییەوە، لە داری هەمەجۆرە دروست دەکرێت، بە تایبەتیش لە داری هەنار یا هەنجیر هەر وەکوو لە گۆرانی کوردی و لە لای لایەی دایکی کوردی میهرەبانـدا دەردەکەوێت، کە منداڵەکەی دەلاوێنێتەوە بۆ ئەوەی بنوێت.

هەروەها منیش دەمپرسی، بۆچی دایکی کورد منداڵە کۆرپەکەی بەم رادە بێ بەزەییە لە جێگالیەکی داردا، دەست و پێیەکانی بەند دەکرد؟ منداڵێک چۆن خەوی لێدەکەوێت، کە نەتوانێت دەستەکانی و پێیەکانی ببزوێنێت؟ دەبێت چ پەندێك لە دوای ئەمەوە هەبێت؟

تا ئێستا لە چەشنی (لانک)ی کوردی، لە کولتوورەکانی تردا بەرچاوم نەکەوتووە، نازانم ئەم وشەیە لە کوێیەوە هاتووە، وەرگێڕانەکانیشی نازانم، دەشێ (لانە) بگرێتەوە یا شوێن، هەر وەکو لە وشەی (لانە) دا دەردەکەوێت. وەڵامی ئەم پرسیارانەم دەست نەکەوت، تا ئەو کاتەی کە خاتمە شارەزایەکی دەروونی کۆمەڵایەتی ئەڵمانی بە رێکەوت لە ماڵەکەم دا - لە ئەڵمانیا - ئەو (لانکۆڵە) یەی بینی، کە لە کوردستانەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم.. سەرنجی راکێشا و لێمی پرسی: ئەمە چییە؟

کاتێ کە مەبەستەکەیم بۆ راڤەکرد، کە چۆن منداڵی کۆرپەی بەسزمانی کورد لە ناویدا دەنوێت.. شارەزاکە سەیری دەکردم و بەزەیی بە ئاتارامی مندا دەهاتەوە و وتی: "پێویستە منداڵ هەر لە کۆرپەییەوە فێری ئەوەبێت، کە سنووری دەروونی و جووڵەیی و کۆمەڵایەتیی خۆی رابگرێت.. نووستنیش بەم شێوەیە لە

بەرەڵدا، منداڵ فێری ئەوە دەکات کە بە شێوەیەکی گشتی، ڕێز لە سنوور بگرێت"

ئایە ئەمە بەجێیە؟ من چاوەڕوانی ئەوەم لێی دەکرد، کە پێی سەیربێت و ئەوە بڵێت کە دایکانمان نەزانن، نازانن زیانی توندبەستنی دەست و پێیەکانی منداڵی کورپەی نەرم و نۆڵ بەم شێوە ڕەقییە چییە، کە ئەو لە قۆناغی گەشەکردنی سەرەتای دایە.. خانمە شارەزاکە ئەوەی بۆ سەلماندم، کە شێوازی سەرەتایی، کە بووە بە داب و نەریت، هەندێ جار باشترە لە شێوازی تازە، کە بڕوایان پێوەیە، لە کاتی نووستن نابێت ئازادی منداڵ کۆت بکرێت.. شارەزاکە ئەوەشی بۆ زیادکرد، دەشێ دایکی کورد شێوازی ڕاست فێربووبێت، بێ ئەوەی کە بزانێت سوودەکانی چین.

ئەم قسانەی شارەزا ئەڵمانییەکە، کە (١٨٠) پلە بۆچوونی منی گۆڕی.. ئەوەم بە بیر هاتەوە.. ئەوە لە دایکێکی بەسۆزی کورد ناوەشێتەوە، کارێکی ئەوتۆ بکات کە زیان بە کچۆڵەکەی یا کوڕیلەکەی بگەیەنێت. جێ ماچێکم لەسەر (لانک)ی کوردی شەقڵکرد. ئەوەشم بە خەیاڵ هاتەوە کە من چۆن بە دەست و پێی بەستراوەوە لە ناویدا ڕاکشاوم و دایکە میهرەبانەکەم بە لای لایەی خۆشی کوردی، هەواڵەی خەوێکی قووڵی کردووم"

ناشبێت ئەو ڕاستییەش بشارینەوە، کە پێویستە دایکان ئەوە بزانن، ڕاژەنینی لانک و بێشکە بە قایمی و بە خێرا، زیانێکی زۆر بە مێشکی منداڵان دەگەیەنێت. لەم ڕووەوە دکتۆر (شیراز) دەڵێت:" لە وتارێک زیاترم خوێندەوە کە ڕاژەنینی لانک و بێشکە بە قایمی مەترسیدارە بۆ منداڵان.. لەوانەیە مێشکیان دابڕزێت و ببێتە هۆی مردنیان" بە تایبەتیش ئەگەر منداڵ خەوی نەیات، دایکی تووڕە و

بێزاربێت.. وەک سزادانێک هاواری لێدەکات کە بنوێت، بە قایمیش لانک یا بێشکەکەی رادەژێنێت.

دڵنیام کە زۆربەی هەرە زۆری دایکان، هێندە بەسۆز و دڵۆڤان و خۆراگرن، هەرگیز لە کۆرپەکانیان بێزار نابن و تووڕەش نابن، لە دڵیان نایات کە بە توندی لانکەکانیان رابژێنن و نازار بە جگەرگۆشەکانیان بگەیەنن.. ئامادەن کە بە درێژایی شەو نێشگ بگرن و شەونخوونی بکەن بە دیار کۆرپەکانیانەوە.

لە لێکدانەوەی خەونەکانیشدا، ئەو کەسەی کە لە خەوندا لانک بکڕێت، یا لە ناو لانکدا بێت، ئەوا خێر و بەرکەتی دەست دەکەوێت و دەستیشی بەخێر و بەرەکەت دەبێت.

# لانک و بێشکه و جۆلانێ
# له فۆلکلۆری کوردی دا

به سه‌دان دێڕ و کۆپله و پارچه هۆنراوه و گۆرانی فۆلکلۆری کوردیمان هه‌یه، که به‌سه‌ر لانک و لانکۆله و بێشکه و هه‌لۆرک و جۆلانێ و دیلانێ و سه‌رلانک و سه‌رچاوکه و ده‌سرازه‌ی لانک و داری لانکی منداڵان هه‌ڵدراون.. ناوی ئه‌و دارانه‌ش ده‌به‌ن که له کوردستان دا ده‌ڕوێن و لانک و بێشکه‌یان لێ دروستکراون.. باسیش له به‌ڵه‌دی و له ده‌ستڕه‌نگینی وه‌ستای دروستکردنی لانک و بێشکه له شاره‌کان ده‌که‌ن. بۆ نموونه ئه‌م دێڕه هۆنراوانه‌ی خواره‌وه، به‌سه‌ر لانک و لانکۆله و بێشکه و جۆلانی و سه‌ربێشکه و سه‌رچاوکه و ده‌سرازه‌ی لانک و لانکۆله‌ی منداڵ هه‌ڵدروان.. له ڕاستیشدا هه‌ندێ له‌و دارانه‌ی که له‌م دێڕانه‌دا ناوبراون، لانک و بێشکه‌یان لێ دروست ناکرێن، ته‌نها بۆ سه‌روا و کێش گونجان و میلۆدیی هۆنراوکان وتراون:

داری لانکی داری بی یه
سه‌رچاوکه‌که‌ی چیت هه‌وری یه
* * *
داری لانکی داری قۆخه
سه‌رچاوکه‌که‌ی چیت شلۆخه
* * *
داری لانکی دار هه‌ناره

کەمـــەی لانـــکی بە بزمــــــارە

* * *

داری لانــــــکی بەلالـــــــووکە
وەستای لانـکی لە کەرکـــــــووکە

* * *

داری لانــــــکی داری گــــــیزە
کەمـەی لانـــــکی بە زریـــــــزە
کـوڕ لە مەمکـــان بۆ زیـــــــزە

* * *

لانـــــــک لە دار کــــــــنێری
وەستا هـات لە هەولــــــــێری
لانکی دروستکرد دوێنێ و پــێری

* * *

داری لانــــــکی داری گولــــــێ
سەرچـاوکەکەی چیت مووســــلێ

* * *

داری بێشـــــــکەی داری لاولاوە
وەستای کـارگەی شێخی زەهــــاوە

* * *

رۆلـە بێشـکەکەت داری قـەزوانە
نەمـــامی مەنـــدەی بـاخــی بابــانە

* * *

داری بێشـــکەت داری قـــەزوانە
بەنی دەسرازەت خوری کـــاوڕانە

* * *

داری لانــــکی دار چـــــــنارە

دایــــکی لانــکی گـوێ بـه گــــــواره

* * *

نوســا کارخــاس جـه دار مـطـهـمێ
بێشـکەی پـەی تـلشۆ گـلـێنه و چـەمێ

* * *

داری بێشـکەکەت لـه دار خورمــــایه
رۆلەم سـپـردەی غـەوسی بەغــــدایه

* * *

رۆلــــه بێشــکەکەت لە داری گــوڵە
پێـکەنـیــــــــــەکەت نــــــــارامی دڵە

* * *

داری بێشــکەکەت داری چـنــــــاره
رۆڵەم ســپـردەی وەیسی نـــــازداره

* * *

داری بێشــکەکەت داری خـــڕنووکە
خوازبێـنـیکەرت پـاشـای کـەرکووکە

* * *

بێشکه دروستکەم، بێشکەی ناینەدار
هیچ کەس نەیدیوێ لە روی رۆژگار

* * *

بێشکه دروسـتکەم، زڕزڕەی لـێخەم
تەخت و داخیکەم، کوڕپەکەی تێخەم

* * *

وەســـــتـا دێنــــــنم لـه تـــــــارانێ
لانکێ دروسـت کات بۆ چـاو جـوانێ

* * *

لانکت بۆ دەکەم لە داری قەزوان
دەیرازێنمەوە بە شەوە و شیلان
* * *
لانکت بۆ دەکەم لە دار خورمایە
وەستات بۆ دەهێنم لە ناو بەغایە
* * *
لانکۆلەکەی دار هەنارە
دەسرازەکەی لە کەژ مارە
* * *
لانکت بۆ دەکەم لە دار حەیزەران
خەوت لێبکەوێ تا بەری بەیان
* * *
وەستا دێنم لە سلێمانی
لانک دروست کات بۆ ڤێنمانی
* * *
لانک لە دار هەناری
وەستا بێت لە شەنگاری
* * *
لانکۆلەکەی دار بەڕووە
کورپەکەی من پێی گرتووە
* * *
لانکۆلەکەی دار هەرمێ یە
وەستای لانکی لە ورمێ یە
* * *
لانکۆلەکەی دار هەنجیرە
ملوانکەکەی زێڕ زنجیرە

* * *

لانکۆلـــــەکەی دار عەنـــــــابە
لێــوەی دیــارە مـــالـی کـــــابە

* * *

لانکۆلـــــەکەی داری گـوێــــــزە
سەر لانکـۆلەی چیت تەورێـــــزە
غـەوز لە عـەجەم بـی پارێـــــزە

* * *

هەڵـۆرک هەڵـخـەم لە گـوڵی ژاڵە
تیـا بخـــەفێ کۆرپـــەی دوو ساڵە

# گۆرانی فۆلکلۆری بەسەر لانک

باوترین و خۆشترین گۆرانیی فۆلکلۆری رەسەنی کوردی کە بەسەر لانکدا هەڵدراون، گۆرانی (لانک لانک لانکۆڵێ) یە، هۆنراوە و ئاوازی ( خەلیل سدیقی) یە، کە تا ئێستا چەندین هونەرمەندی گۆرانیبێژی ناسراوی کوردمان بە دەنگێکی خۆش و بە هەمان ئاواز، ئەم گۆرانییەیان وتووەتەوە و تۆماریان کردوون، لەوانەش حەسەن زیرەک، بەڵام هەندێ لە هونەرمەندە گۆرانیبێژەکانمان، تێکست و ئاوازی ئەم گۆرانییەیان بە فۆلکلۆری کوردی ناوبردوون. هەندێ لە لانکۆڵێبێژەکان کەمێک دەستکاری دەقی وشەکانیان کردوون. ئەمەش دەقی (لانک لانک لانکۆڵێ) یەکەی خەلیل سدیقی یە:

<u>لانک لانک لانکۆڵێ</u>

<u>هۆنراوە و ئاوازی: خەلیل سدیقی</u>

لانک لانک لانکۆڵێ
لانک لە دار هەنارێ
وەستا بێ لە تارانێ
لانکێ دروست کا بۆ چاوجوانێ
دەڵێی لە لانکێ دا ناتووم
دەبا بۆی سازکەین جۆلانێ
هەی رۆڵە سەر دڵ خەربی
باب مەردووبی

شەو دەرنــــــگە بۆ جێــژوانێ
نــــــەوە رۆژی روونــــــــــاکە
هەمــــوو عــــــــالەم دەزانــێ

لانــــک لانــــک لانــــــــــکۆڵێ
لانــــک لە دار هەنــــــــــاری

..........

* * *

ئەو قورعانـەی بتـگری هێـنات لێـکت کـردەوە
سێ جـار دەسـت پێـدادا بۆ مزگـوتت بـردەوە
بۆ خۆت کەیفـم بۆ ئەکـەی بە دەسـمـاڵی زەردەوە
ئەمنـت مـاڵ وێـران کـردووە بـە هەنـاسـەی ساردەوە
لانــــک لانــــک لانــــــــــکۆڵێ
لانــــک لە دار هەنــــــــــاری

..........

* * *

قەت نەبوو رۆژێ دانیشین، تـۆزێ کەین را و تەگبیر
سەد نەفرەت لەو کەسە بێ، دەست لە بـاڵات بکا گیر
جا چی بـووە مـاڵی بـابـم، ئەتۆ جحێڵ و ئـەمن پیر
لەبەر مەمکۆڵەی دەمـرم، شیرینە بە وێنەی هەنجیر

لانــــک لانــــک لانــــــــــکۆڵێ
لانــــک لە دار هەنــــــــــاری

..........

* * *

کەی دانیشـن دوو بە دوو، قەد باریکەی خاڵ لە روو

مەمکێکت وێنەی هەنـــار، یەکێ خڕە وەک هەڵوو
قوڕی دنیـــام وەسەر کەن، ڕۆیـــی و لە دەستم چوو
سنگی کارخـــانەی قەنـدە، لەسەر چۆمی چەغەتوو

لانـــک لانـــک لانـــــــکۆڵێ
لانـــک لە دار هەنـــــــاری

هەندێ جاریش بە هەر هۆیەکەوە بێت، منداڵ لە نێو لانکدا، خەوی لێنەکەوتووە، دایک لە نێو ژوورەکەیدا، جۆلانێی بۆ هەڵواسیوە و منداڵەکەی خستۆتە نێو جۆلانێوە و بە نەرمی پاڵێ پێوەناوە، یا خستوویەتە نێو هەڵۆرک و بە نەرمی ڕایژەندووە، تا ژێر بێتەوە و خەوی لێبکەوێـــت. دەبینـــین لە هەنـــدێ لە گـــۆرانییە کـــوردییە فۆلکلۆرییەکانی دایکان بۆ منـــداڵان (لانـــک لانـــک لانـــکۆڵـــێ) لە پـــاڵ نـــاوی (لانـــک) دا نـــاوی (جـــۆلانێ) و (هەڵـــۆرک) یـــش هاتوون.

ئێمە لێرەدا تەنها کۆپلەی یەکەمی گۆرانییەکانمان نووسیوە، کە وشەی (لانـک) یان تێدان، ئەو دوای کۆپلەکانی گۆرانییەکان لە لای هونەرمەندان کەمێ جیاوازییان هەیە. تەنانەت لە کۆپلەی یەکەمی گۆرانییەکانیشدا، جیاوازییەکی زۆر کەم هەیە:

لانکۆڵێ.. مەزهەر خالقی

لانـــــــک لانـــــــک لانـــــــکۆڵێ
لانـــــــک لە دار کنـــــــــــــێرێ
وەســـتا هـــات لە هەولـــــــێرێ

لانـکی درووستکرد لوێنێ و پـــــێری
رەوارەی لانـــــــکی کـــــــورتە
ئـاگـــاگلتە مـــــەمکی مـــــــێری
ئەی رۆڵـە سەر دڵ خڕ بێ باب مـردووبێ
شـــــەو درەنـــــگە بۆ جـــێژوانێ
جـا ئـــــەوە رۆژی روونـــــــــاکە
هـەمـــــوو عـــــالەم دەیـــــــــزانێ

<u>لانکۆلێ.. مەرزییە فەریـقی</u>
<u>(١٩٥٨ـ٢٠٠٥)</u>

هونەرمەنـــدی ئەمرمـــان خاتـــوو (مەرزییـــە فـــەریقی) هـــاوژینی هونەرمەند (ناسر رەزازی) خـاوەنی دەنگـێکی رەسەنی کـوردییە.. یەکێک لە گۆرانییە خۆشەکانی (لانکـۆلێ) یە، کە بـە چـریکـەیەکی زوڵاڵ چڕویتی.. دەق و ئـاوازەکەشی ئـەوەی (سـدیق خطیلی ) یە.

لانـــــــک لانـــــــك لانـــــــــکۆلێ
لانــــــــک لـە دار هـەنـــــــــــارێ
وەســـــــتا بـــێ لە تـــــــــــارانێ
لانـــــکی دروست کـا بۆ چـاو جـــوانێ
دەڵـــــێ لە لانــــــکێدا نـاڵــــــــووم
دەبـا بـــۆی ســـــازکەم جـــــۆلانێ
هەی رۆڵە سەر دڵ خـڕ بێ باب مردووبێ
شـــەو درەنـــــگە بۆ جــــــێژوانێ
تـــــاوە رۆژی روونــــــــــــاکە

هـــــممـوو عـــــالـمم دميـــــــــــــزانێ

* * *

قمت نمبوو بلَێ دانشين تۆزێک بکمين را و تمگبير
سمد نمفرمت لمو کمسه بێ دمست له بالآت بکا گير
جـا چـی بـوو مـالّه بـابـم نمتو جحێـل و نممن پير

* * *

نـمو قـورعــانمی بتـگرێ هينـات لـێکـت کــــردموه
سـێ جـار دمسـت پـێدادا بۆ مزگـــموتـت بـــردموه
بـۆ خۆت کميـفم بـۆ دمکـمی بــدمم نــاخ و دمردموه
دمسـتمو نمژنـۆت دانـــاوم به هـمنـاسـمی سـمردموه

* * *

لانـــــــــک لانـــــــک لانــــــــــکۆلێ
لانــــــــک لـه دات هـمنــــــــــــارێ
ومســــــــتـا بـــێ لـه تــــــــــارانێ
لانـــکێ دروسـت کا بۆ چـاو جـــــــوانێ
دمڵـــێ لـه لانـــــکێدا نـانـــــــــووم
دمبـا بـۆی ســـــازکمين جــــــــۆلانێ
هۆی رۆڵه سمر دڵ خرِ بی باب مردووبی
شـــمو درمنــــــگه بۆ جــــــێژوانێ
تـــــاوه رۆژی روونـــــــــــــاکه
هـممـــوو عـــــالـمم دميـــــــــــزانێ

وشـمی (لانکـۆلێ، لانکـۆلّه) هـمردوو نـاوهکه، بچـووکراوهی نـاوی (لانـک) ن، له زمـانی کوردیدا دموترێت (کیژ ـ کیژۆلـه، نـاسـک ـ نـاسکۆلـه، لانـــک ـ لانکـۆلـه، بمرخ ـ بمرخـۆلـه) بچـووکردنـموهی

ناوش، زۆر جار بۆ خۆشەویستی و شیرینی و سووکی و بۆ چێژ و خۆشییەکی زیاتری سەر زمان بەکاردەهێنرێت.

گۆرانیی (لانکۆلێ) گۆرانییەکی کۆن و رەسەنی کوردییە، تێکست و ناوازەکەشی فۆلکلۆری کوردییە. چەند هونەرمەندێکی گۆرانیبێژی ناسراوی کوردمان لانکۆلێ یان وتۆتەوە، لەوانەش: محەممەد ماملێ، ناسر رەزازی، حەسەن زیرەک، سمایل ماملێ. کە بە دوو ناونیشانی جیاواز و بە کەمێک جیاوازیش لە تێکستەکەیدا، لانک لانکۆلێ یان وتووە و تۆماریان کردووە. سەرناوی لانکۆلەکەی مامەلێ (لانکۆلەکەی دارە سێوە) سەرناوی لانکۆلەکەی حەسەن زیرەک و ناسر رەزازی (لانکۆلەکەی دارە هەنارە) یە.

<u>گۆرانی : لانکۆلەکەی دارە سێوە</u>
<u>هونەرمەندی گۆرانیبێژ : محەممەد مامەلێ</u>
<u>تێکست و ناواز : فۆلکلۆری کوردی</u>

هونەرمەندی گەورەی گەلەکەمان (محەممەد سەعید عەلی ) کە بە (محەممەد مامەلێ) ناسراوە (١٩٢٥ــ ١٩٩٩) هونەرمەندێکی بلیمەت و بەرهەم جوان و نایابە، خاوەنی رێچکەیەکی تایبەتی و قوتابخانەیەکی هونەری گۆرانیی کوردییە. بە دەیان تێکستی فۆلکلۆری و هۆنراوەی هۆنراونووسانی کوردی کردوون بە گۆرانی و توونەتەوە و تۆماری کردوون. چەند گۆرانیبێژێکی کوردمان، چەند گۆرانییەکی ماملێ یان وتۆتەوە، بەڵام هیچیان نەگەیشتوونەتە ناستی سەدای زوڵاڵ و ناوازە خۆشەکانی مامەلێ.

مامـلی، هونەرمەندێـکی دڵـسۆز بـوو، کـورد و کوردســـتان پەروەرێـکی نلسـراوبـوو. بە دەنگێکی خۆش و ناوازێکی شیرین و رەسەن (لانکۆڵەکەی دارە سێوە)ی وتـووە:

لانکــۆلـەکەی دارە ســێوە.. ورە وەرە لانــکێ
گۆشـەگـەری بـە لانــکێوە.. وەرە وەرە لانــکێ
رۆڵـە بۆ نانووی پارشـێوە.. وەرە وەرە لانـکێ
نـەری لانـــک دارە.. مـــەزەدارە.. شـــەدە لارە
گـــــوێ بـە گـــــوارە ، وەرە وەرە لانــــکێ
رایـدەژێنێ بـــووکە زارا.. وەرە وەرە لانــــکێ

* * *

لانکۆلەکەی دار خورمـایە.. وەرە وەرە لانــکێ
سەر لانــکەکەی لە کامـوایە.. وەرە ورە لانــکێ
کورپـەم بۆچی خـەوت نایە.. ســاوانەی دایــکێ
نەری لانـــک دارە.. مـــەزەدارە.. شــەدە لارە
گـــــوێ بـە گــــوارە.. وەرە وەرە لانــــکێ
رایـدەژێنێ بـــووکە زارا.. کورپــەلەی دایــکێ

* * *

لانکـۆلەکەی دار شـــیلانە.. وەرە وەرە لانــکێ
سەر لانکەکەی چەپی رەزانە.. وەرە وەرە لانکێ
کورپـە بـۆ نانـووی بەیـانە.. سـاوانـەی دایـکێ
نـەری لانـــک دارە.. مـــەزەدارە.. شـــەدە لارە
گـــــوێ بـە گـــــوارە.. وەرە وەرە لانـکێ
رایـدەژێنێ بـــووکە زارا.. کـورپــەلەی دایـکێ

* * *

لانکــۆڵەکەی دارە بـێیە.. وەرە وەرە لانـــکێ
سەر لانکەکەی چیتی خمییە.. وەرە وەرە لانـکێ
رایدەژێنێ بووک نەستییە.. سـاوانەی دایــکێ
نـەری لانـــک دارە.. مــەزەدارە.. شـەدە لارە
گــــــوێ بە گــــــوارە.. وەرە وەرە لانـــکێ
رایـدەژێنێ بــووکە زارا.. کورپـەڵەی دایــکێ

(لانکۆڵەکەی دار هەنـارە)ی هونەرمەنـدی گۆرانیـبێژی کوردمـان، کاک (نەسر رەزازی) بە دەنگێکی شیرین و بە رتمێکی خێرا دەیڵێت و تۆماری کـردووە.. هـۆنراوە و میلـۆدی گۆرانییەکە فۆلکلۆرییە. کـاک نەسر رەزازی خـاوەنی دەنگێکـی رەسـەنی کوردییە، کـورد و کوردستان پـەروەرێکی دڵسۆز و نەسـراوە، پێشمەرگەیەکی دێـرینی شۆرش و شاخ بوو، هونەرمەنـدێکی گەورە و رەسەنە.. ئەمەش دەقی (لانکۆڵێ)ی کـاک نەسر رەزازی یـە:

<u>گۆرانی : لانکۆڵەکەی دار هەنـارە</u>
<u>هونەرمەنـد : نەسـر رەزازی</u>
<u>هۆنراوە و ئـاواز: فـۆلکلۆری کوردی</u>

لانـکۆڵـەکـەی دار هـەنـــارە.. وەرە وەرە لانـکێ
رایـــدەژێنێ بــووکـە زارا.. دولـبەرەی دایـکێ
* * *
لانکـۆڵـەکـەی دارە بـــێ یە.. وەرە وەرە لانـکێ
سەرەدەمکەی چیتی سپی یە.. دولبەرەی دایـکێ

رایەدەژێنێ بووک ناسی یە.. ساوالەی دایکێ

* * *

لانکۆلەکەی دارە سێوە.. وەرە وەرە لانکێ
رۆلە گۆش گیرا بە لێوە.. دولبەرەی دایکێ
بەرخەم بۆ نانوی پارشێوە.. ساوالەی دایکێ

* * *

لانکۆلەکەی دارە گوێزە.. وەرە وەرە لانکێ
سەر لانکەکەی چیتی تەورێزە.. دولبەرەی دایکێ
غەوس لە عەجەم بێ پارێزە.. ساوالەی دایکێ

* * *

لانکۆلەکەی دار خورمایە.. وەرە وەرە لانکێ
کەتانەکەی لە کۆڵ دایە.. دولبەرەی دایکێ
رۆلە بۆچی خەوت نایە.. ساوالەی دایکێ

* * *

لانکۆلەکەی دار رەزانە.. وەرە وەرە لانکێ
دەسرازەکەی لە کەتانە.. دولبەرەی دایکێ
لێوەی دیارە مالی کابە.. ساوالەی دایکێ

* * *

لانکۆلەکەی دار چنارە.. وەرە وەرە لانکێ
دەسرازەکەی لە کەژ مارە.. دولبەرەی دایکێ
بەرخۆلەکەم زۆر نازدارە.. ساوالەی دایکێ

## لانلانکولەیەکی تری محەممەدی ماملێ

زۆر جار منداڵ لە لانکدا نانوێت بنوێت، دایک و باوکی

جۆلانێی بۆ هەڵدەواسن، بەڵکو لە نێو جۆلانێدا بنوێت.

لانـــــک لانـــــک لانـــــکۆڵێ
لانـــــک لە شـــــتڵە بـــــێزایە
وەســـــتا بـــــێ لـــە بەغـــــدایە
لانـــکی دروسـت بۆ لەیـــــلایە
دەبـــێ بـــۆی سـازکەم جــــــۆلانێ
لە لانـــــکی دا خـــــەوی نـــــایە

لە دەڤـــەری بادینانـــیش دا چەنـــدین هونەرمەنـــدی گـــۆرانیبێژی کوردمان بەسەر لانـکدا، بەیت و گـــۆرانی فۆلکلۆریـیان وتـووە، ئەمـە دێـڕێکی یەکێکە لـەو گۆرانییانـەیە:

دادێ لانـــــــکێ ب هـــــــەژێنە
لـۆ کـــوڕێ ســـاڤا بخـــــــوێنە

لەم کۆپلە هۆنـــراوەیەی خـــوارەوەدا کە (نـاوی هۆنـــراوەنووسەکەیم بەرچاو نەکەوتووە) جەخت لەسەر ئەوە دەکات، کە پێویستە دایکـانی هۆشـیاری کوردمــان، هــەر بە کــوڕپەی جگەرگۆشەکــانیان بـــە کوردســـتان پـــەروەری گـــۆش بـــکەن.. لە نێـــو لانـــکی کوردایەتـــیدا پەروەردەیـــان بـــکەن.. چـــاو بە ئەخـــشەی کوردســـتانی داگیرکـــراودا هەڵبێنن.. بە کوردستان بێنە گڕوگـــاڵ، تـــا کـــە گـــەورەبوون تـــۆڵـــە لە داگیرکەرانی کــوردستان بکــەنەوە:

خەریـــتەی هەمــوو خـــاکی کوردســـتان
دایـک بە دەرزی و دەزوو و دروومـــان
بکێشـێت لەسەر سەربێشـــکەی منـــاڵ
هـەر بـە کوردســـتان بێتە گـڕوگـــــڵ
لـە بێشـــکەی وایـا چـــاو هـەڵنەهــێنێ
دڕۆیــــە هەســـتێ و تۆڵــــە بســـێنێ

# لانـک و بێشکە لە هـۆنراوەی کوردی دا

وەکـوو نمـوونە لە هـۆنراوەی هۆنراوەنووسـانی کوردمـان لەسـەر لانـک.. ئەم هۆنراوەیەی هۆنراوەنووسی نەمری گەلەکەمـان کـاک (شـێرکۆ بـێکەس: ١٩٤٠ــ ٢٠١٣) م هەڵبـژارد، کە لەژێـر نـاوی (بێـشـکە) دایە.. بـڕوانن کە شێرکۆ بـێکەس، چەنـد بە جـوانی و ناسـکی و شـیرینی پەیـامە پـڕ لە مەبـەست و واتـاکەی بە هۆنراوەدۆستانی کوردمـان دەگەیەنێـت.. شـێرکۆ بێکەس چـوار بێشکەی سوور بۆ کوڕەکـانی کوردمـان لە دار و لە تەختەکـانی ئەو سێدارەیە دروست دەکات کە سەرۆک کۆمـاری کوردستان پێشەوای نەمرمـان شـەهید قـازی محـەمەد و حەمەحـوسێن سەیـفی قـازی (ئامـۆزای پێشەوا) و ئەبولقاسم سـەدر قـازی (برای پێشەوا) کە لە (٣٠ی/ نـادار/١٩٤٧) لە گۆڕەپـانی چـوارچرا لە (مەهـاباد)ی پایتەخـتی کۆمـاری کوردسـتان، پێـیان لە سێـدارە دران. شـێرکۆ بێکەس چـوار بێشـکە سوورەکە دەنێرێـت بۆ (بـاکوور، رۆژهەڵات، باشوور، رۆژئـاوای) کوردستان. بێشکەکان لە ماڵەکانی کوردستان دا دەسـووڕێنەوە، ئەم دەسـت و ئەو مـاڵ و ئەو مـاڵ.. ئەم دەسـت و ئەو دەسـت دەکـەن، ئـەوە لە دوای ئـەوەی تـازەی کـورد تێیانـدا، بە بیـر و بە رێبـازی کوردایـەتی و ئـازادیخـوازی و رزگـاریخـوازی شەهیـد قـازی محەمـەد گـۆش و پـەروەردە دەکـرێن. بێـشکە لەم هۆنـراوەیەی شێرکـۆدا، هێـمایە بـۆ ئەمـری کـورد و بـۆ بـیری کوردایەتی و کوردسـتان پـەروەری و بـۆ ئەمری و درێـژەدان بە خەبات و شۆڕش، ئـەو پەیـامەش بـە داگیرکـەرانی رەگـەزپـەرسـت

و بە نەیارانی کورد و کوردستان دەگەیەنێت، کە خەیاڵیان خاوە، گەر وابزانن بە لە سێدارەدانی قازی محەممەد چۆکیان بە گەلی کوردمان داداوە، یا بێ هیوایان کردووین و دەستمان لە خەبات و لە قوربانیدان هەڵگرتووە.

کورد هەرگیز نامرێت و دەمێنێت، ئەوە لە دوای ئەوەی تازەی کوردمان پێگەیشتوون و پێدەگەن، کە درێژە بە پەیام و بە رێبازە پیرۆزەکەی پێشەوای ئەمەر قازی محەممەد دەدەن.. لە ئەمڕۆدا بە هەزاران تێکۆشەر و شۆڕشگێری دڵسۆزی کوردستانمان، کە لە دەرچووانی قوتابخانەی کوردایەتی قازی محەممەدن گیانبەخشانە درێژە بە خەباتی رزگاریی کوردستان دەدەن.. ئەمەش دەقی هۆنراوەی (بێشکە)ی (شێرکۆ بێکەس)ە:

که لاشەی ساردی چواچرا
وەکوو هێشووی سەرما بردوو
لە سێدارە کرانەوە،
دار.. بەجێ ما،
هەژارانی سابڵاخ بردیان!
زستانیش بوو نەیانسووتان!
لەو دارانە.. لەو تەختانە
چوار بێشکەی سووریان دروست کرد،
لەو رۆژەوە هەتا ئەمڕۆ،
ئەو لانکانە
هەر ئەگەڕێن،
ئەم ماڵ.. ئەو ماڵ
ئەم دەست.. ئەو دەست

وەریـــــان دەگـــــــــــــــــــــرن
ئـەی نابیـنی هـەزاران قـازی محـەمەد
لەسەر لـوتـــــــــــکە وەستاون و
چـــــــــــــەک هەڵـــــــــــنەبڕن؟!

## لانك

ئەمەش سێ دێڕە لە هۆنراوەیەکی دکتۆر (ئیبراهیم ئەحمەد شوان) لـە ژێر ناوی (لانك) دا، کە بە کەرە ستەکی پیرۆزی دەزانێت:

لانك چەندە پـــیرۆزی
کانی هەست ودڵسۆزی
تۆقرەگاهی مـــــــــــندالی
لای لایـەیەکی زوڵاڵی
ژێرم دەکەی لە گـریان
دەمپـــارێزی لە زریان

# كورتە فیلمی كوردی لانـك بۆ منداڵان

هونەرمەنـــدی لاوی كـورد زانیــار لــوتفی هەڵگـری بـڕوانامەی ماسـتەر لە بەشـی سـینەما لە زانكـۆی تــاران، بەرپرسـی هونــەرە وێنەییەكـانیشە لە شـاری (سـنە) لە رۆژهـەڵاتی كوردستان، توانـایەكی باشـی لە دەرهـێنانی بـواری شـانۆ وسـینەمادا هـەیە. تـا ئێستا چوار كورتــە فیلمـی بــۆ منــداڵان بە زمــانی كــوردی دەرهــێناوە، لەگەڵ فیلمێكی دیكۆمێنتاری دا.

كاك زانیـار لـوتفی بە كورتە فیلمـی (لانــك) كە فیلمێكە بە زمـانی كـوردی بـۆ منـداڵان، لە شـانزەمین فیـستیڤـاڵی نێونەتــەوەیی ســاڵانەی (ئیــسپانیـا) كە لە (١٦ی/ یــانوار/٢٠١٨) لە شـــاری (بـۆرگـــسی) بەرێوەچــوو، بەشــداری كـرد.. خــەڵاتی باشـترین كـورتە فـیلم و تابلـۆی دیپلۆمـای فیستیڤـاڵەكیان بە كورتە فیلمی (لانــك) بەخـشی. ئەم فـیلمە و شـەش كـورتە فـیلمی تـری كە بە زمـانی كـوردین بــۆ منــداڵان، لە هەشــتەمین فیـستیڤـاڵی فـیلمی منــداڵان لە (هیندسـتان) نمـایش كـردن.. پیـرۆزبایی و دەستخۆشـی لە كـاك زانیــار لــوتفی دەكەیـن و هیــواداریـن درێـژە بە خزمەتكـردنە پیــرۆزەی بـدات و چەنــدین بەرهەمـی تـر دەربهــێنێت و زیـاتــر فۆلكلــۆری رەســەنی كوریمــان بە گەلانــی جیهــان بناسـێنێت.. بە تـایبەتیش درێــژەدان بە بواری ئـەدەب و درامـا و سـینەمای منـداڵانی كوردمـان كـارێكی پێویست و پیـرۆزە.

# ژنان کەسایەتی خۆیان لە منداڵەکانیاندا دەبیننەوە

کە بووکیان بە بووکی بۆ ماڵی زاوا دەهێنا، کچان و ژنان دەهاتن بۆ سەیرکردنی، هەندێ ژن منداڵەکەی دەخستە باوەشی بووکەکەوە، بە تایبەتیش کوڕ بەو نیاز و مرازەی کە دووگیان بێت و نۆبەرەکەی کوڕ بێت بووکەکەش ماچێکی منداڵەکەی دەکرد، ئینجا دایکی لە باوەشی لایدەدا.. نەقڵیەتی کۆن و خێڵایەتی و پیاوسالاری تا ئەمڕۆش، نەک تەنیا لە کۆمەڵگای کوردیدا بە ڵکو لە زۆربەی کۆمەڵگاکانی جیهاندا، کوڕیان لە کچ بە باشتر دەزانی، کوڕیان بە کۆڵەکە و بە بڕبڕەپشتی خێزان و بە ناواتی دایک و بە سەربەرزی باوک ناودەبرد، بە مایەی بەختەوەرییان دەزانی، کچیشیان بە پەژارەی باوک و بە سەرکزلەیی دایک دەزانی. لەدایکبوونی کچ مایەی شەرمەزاری بووە لایان، تەنانەت عەرەبەکانی بیابانی عەرەبی، هەر بە منطوتەیی کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکردن، لە دایکبوونی کچ بە لایانەوە بەدبەختی و بارگرانی و شەرمەزاری بوو بۆیان. گەر خێزانێک کوڕیان نەبوایە، دە کچیشیان بوایە، بە وچاخکوێر ناویان دەبرد. یا پیاو ژنێکی تری هێناوە بۆ ئەوەی لە ژنی دووەمی کوڕی ببێت. بەڵام سەردەم و نەقڵیەت گۆڕاون، لە ئەمڕۆدا، جیاوازیکردن لە نێوان کوڕان و کچاندا زۆر کەم بۆتەوە، مەگەر کەسانێکی کۆنەپەرست و دواکەوتووی نەقڵ سڕبوو ئەم جیاوازییە بکەن.

مژدەی دووگیان بوونی ژنان، خۆشترین مژدەیە بۆ خۆیان و بۆ هاوسەرەکانیان و بۆ کەسوکار و خانەوادەکانیان، یەکسەر

دایکـانیان و خەسووەکـانیان هەڵهەڵـەی خـۆشی لێـدەدەن.. بـە شاتازییەوە ئەم مژدەیە بڵاودەکەنەوە.

ژنـان ژنایـەتی و کەسایەتی خۆیـان لە منـداڵبوون و لە دایکایەتیـدا بەدیـدەکەن، شـانازی بە دایکایەتییـانەوە دەکەن.. کە منــداڵیان دەبێـت زۆر دەگـەشێنەوە، یەکسەر کۆرپەکـانیان دەخەنە سەر دڵییـان و تـێر ماچـیان دەکەن.. ژیـانی هاوسەرگیریــشیان خۆشـتر و شــیرینتر دەبێت.. هەستیش بەوە دەکەن کە رێزێکی زیاتریان لێدەگرن.. لە تانە و پـلار و توانجــی خەڵکـیش رزگاریـان دەبێـت کە بە نەزۆک و وجاخکوێـر ناویان بەرن. بۆیە منداڵبوون و دایکـایەتییان بـە مایـەی بەختەوەری و شـادی و خـۆشی دەزانـن.

دایکـانی کوردمـان، گـرنگییەکی زۆریـان بـە کـۆرپەکـانیان داون و دەدەن، بە نــەوپەڕی توانایــان و بــە هـۆشیارییەوە، هەوڵــیان داوە و هەوڵـدەدەن، کـە بـە باشـی و بـە جـوانی گۆشـیان بکەن و بە دروستی پەروەردەیـان بکەن و پێیان بگەیـەنن.. تـا نـەوەی جەستە تەنـدروست و دەروون دروسـت و هـۆش گەش و خەیــاڵ فـراوان پێبگەیەنن.. شـەوان تـا بەیـانی بە دیـاری لانــک و بێشـکەی کۆرپەکـــانیانەوە ناخـەون و نێشکیان دەگـرن.. ئــەم ئەرک و قوربانیـدانەش هەر لە دایکـانی میهرەبان و سـۆزداری بێپایـان دەوەشێنەوە.

دایکــان کە کــاتی نووسـتنی منداڵەکـــانیان دێـت، یەکـسەر نایــان خـەوێنن، لە پێشا تـاوێکی بــاش یـاری و بــەزم لەگـەڵیانـدا دەکـەن، هەڵـیان دەپـەڕێنن و دەیـان گـەوزێـنن و تلـیان پێـدەدەن، دەسـت و پێیەکـانیان دەبــزوێنن، خـتووکـەیان دەدەن، دەیانـهێننە زەردەخـەنەی ناســک و پێکەنیــی شــیرین و زاق و زرووقــی خــۆش، گـــۆزان گـۆزانیان لەگەڵ دەکەن، تـا کفـت دەبــن و شـل و خـاودەبنــەوە و باوێشـک دەدەن و مەیـلی نــووستن دەکـەن. ئەوسا دایکـانیـان تێـر

شیریان دەدەنی و تێر ماچیان دەکەن و دەیانخەنە ناو لانک یا بێشکەکانیانەوە.. بە دەنگێکی ناسک و بە ئاواز و سەدایەکی شیرین لەگەڵ راژەنینی لانکەکانیاندا، لای لایە و گۆرگانە شەوی و گۆرانیان بۆ دەڵێن، تا بە ئارامی و بەبێ ترس، بە خۆشی بنوون.. بۆ ئەوەی خەمڕیان نەبێتەوە و زڕخەو نەبن، بێدەنگی ژوورەکانیان رادەگرن.

ئەم شێوازەی دایکان، بۆ ئەوەی بە خۆشییەوە کۆرپەکانیان بکەنە خەو، لە رووی جەستەیی و دەروونییەوە گرنگی و سوودێکی زۆریان هەیە.. توێژینەرانی دەروونی پاڵپشتی و جەخت لەسەر سوودەکانی ئەم شێوازە سەرکەوتووەی دایکان دەکەنەوە. ئەم دیاردانەش لە لای دایکانی هەموو گەلان، لە یەکەوە نزیکن، چونکە سۆزداری و خۆشەویستی دایکان بۆ کۆرپەکانیان، لە لای هەموو دایکان سروشتی و رەمەکین.

دایکانی کوردمان بەوە ناسراون، کە جیاوزن و خاوەنی دەنگێکی ناسک و ئاوازێکی شیرینن، بە تایبەتیش لە لای لایەکردن و لورین و لاواندنەوە و پیاهەڵدان بەسەر کۆرپەکانیاندا.. ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە دایکانی کوردمان لە رادەبەدەر سۆزدار و دڵۆڤانن، خۆشەویستییەکی بێپایانیان بۆ کۆرپەکانیان هەیە.

# شەوارەگرتن و ئەفسانەی شەوە

لە کوردەواریـــدا، بە تـــایبەتی لە دێیەکـــانی کوردســـتانی نیـــشتمانی شیرینمان، تـا سالانـێکی نـزیکی بـەر لـە ئەمـڕۆ، ئەریـت نامـیز باوبـــــوو، کـــــە منداڵـــــێک لە دایـــــک بـــــوایە، ئەو مـــــاڵە پڕ دەبوو لە خۆشی و شادی.. کوڕ بوایە یا کچ (شەوارە) یان بۆ دەگـرت، خـەڵکی دێیەکـەیان، بە تـایبەتیش لاوان دەهـاتن بۆ ئەو مـاڵە و بە گەرمـی پـیرۆزباییان لە بـاوک و دایـکی منـداڵە تـازە لە دایکـبووەکە دەکـرد.. لـە ئـێوارەوە تـا بەرەبەیـان دادەنیـشتن و گۆرانییان دەوت و هەڵپەرکێیان دەکرد، پێدەکەنین و قسەی خۆش و سـوعبەتیان دەکـرد و بەزم و رەزمـی خۆشـیان دەگێـڕا.. هەنـدی جـاریش بە پێشنیار و هەڵبـژاردەی ئەو لاوانە ناویـان لـە منـداڵەکە دەنـا. خـاوەن مالـەکەش شەوچـەرەی بـۆ شەوارەگـران دادەنـان کە بریتـی بـوون لە (گوێـز، قەسـپ، مێـوژ، نـاوکە) چێشتـیشیان بـۆ لێدەنـان، هەمـووی بە خـۆشـی ئـەوەی، کـە منداڵـیکی تـری دێیەکەیـان زیـادی کـرد. مەبەسـتێکی تریـش لە شەوارە گـرتن ئـەوەبـوو، کـە "شـەوە" گوایـە جنۆکـەیەکی شـەویی بەدەکـارە و خـۆشی بەوەدا نایات کە منـداڵ لەدایک بێت، بە شەوان کاری خراپی خۆی ئەنجام دەدات کاتێک کە دایـک و بـاوکی مەلۆتـکەکە بخـەون و ناگـایان لـە مەلۆتـکەکەیـان نەبێت بە هەلی دەزانێت، کە لە کـونی دەرگـای ژوورەکەوە یا کـلاوڕۆژنە و دووکەڵکـێشی مـاڵەوەکەوە، خۆی بگەیەنێتە ئەو مەلۆتکەیە و شێتی بکاتەوە و بیخـنکێنـێت.. بۆیە دایـک و بـاوکی مەلـۆتکەکە و لاوە شـەوارەگرەکان نـاخەوتن و تـا کـازیوە شـەوارەیان دەگرت و دەنگیـان دەهـات، تـا (شـەوە) لێیـان

بترسێت و نەتوانێت لە کورپەلەکەیان نزیک بێتەوە و دەستی لێبوەشێنێت. هەر بۆ ئەم مەبەستەش خەنجەرێکی دەبان و قورئانێکیان لە نزیک سەری مەلۆتکەکەوە دادەنان. خۆشبڕوا بوون و بڕوایان وابوو کە شەوە لە خەنجەر و لە قورئان دەترسێت و ناوێرێت لە مەلۆتکەکەیانەوە نزیک بێتەوە. ئەم ئەریتەش لەو باوەڕەیانەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە قورئان پیرۆزە و خەنجەریش تیژە (خەنجەری دەبان لای کورد هێمایە و چەکێکی رەسەنی بەرگریکردنە لە خۆ) ئەمەو مووروویەکی رەشیشیان بە قوماتی منداڵەکەوە بە سنجاقێک قایم دەکرد، گوایە ئەو موورووە رەشە تایبەتییە و پیرۆزە و دژەشەوەیە. گەر منداڵەکەیان شین ببوایەتەوە و بمردایە بڕوایان وابوو کە شەوە بردوویەتەوە. من بڕوام بە شەوە و جنۆکە و رەمووزن نییە. بە قسەی پڕوپووچی ئەفسانەییان دەزانم.. تا ئێستا کەس شەوە و جنۆکەی نەبینیوە. لە راستیدا هۆیەکی مردنی ئەو منداڵە مەلۆتکەییانە، بۆ دوو هۆی سەرەکی دەگەڕانەوە، کە هەردوو هۆیەکە پەیوەندییان بە نابەڵەدی مامانی ناوکبڕی کاتی منداڵبوونەکەوە هەبووە. لەوانەیە مامانەکەی بە گوێزانێکی پاقژنەکراو ناوکی منداڵەکەی بڕیبێت. کە هەندێ لەو گوێزانانە ژەنگاوی و ژەهراوی بوونە، بۆنەتە هۆی تووشبوون بە"گزاز" و بە ژەهراوی بوونی خوێنی منداڵەکە و مردنی لە ماوەی چەند رۆژێکدا.. یان دەگەڕێتەوە بۆ یارمەتیدانی هەڵەی مامانەکەی لە کاتی لە دایکبوونی ئەو منداڵە و ئەزیەتی بە (مێشکۆڵە)ی گەیاندووبێت و بۆتە هۆی مردنی. لە ئەمڕۆدا لە سایەی پێشکەوتنی پزیشکی و هۆشیاری دایکان و پسپۆڕیی مامانەکان و لە دایکبوونی منداڵان لەژێر چاودێری و سەرپەرشتیی پزیشکانی پسپۆردا، لە نەخۆشخانەکانی لەدایکبووندا، رێژەی مردنی منداڵانی تازە لەدایکبوو بەراورد

بـه جـاران زۆر كەم بوونـەتـەوە.. نەریتـی شـەوارە گرتنیش كـاڵ بۆتـەوە.. خێزانەكـانیش شەوارە نـاگرن.

ئەمەو زۆربـەی پـزیشـكەكـان، جەختیان لەسەر ئـەوە كـردۆتەوە، كە دە رۆژی یەكەمـی دوای لەدایكـبوون لە ژیـانی كۆرپـەلەدا زۆر گرنـگ و چارەنـووس سازە، گەشەكـردن و دەربـازبووبـوونی لەو دە رۆژەدا، بە واتـە لە مەتـرسی مـردن رزگـاری بـووە و دەژیـت. جـا دایكـان و باوكـان ئەمە بـزانن یـا نەزانـن، ناگـاداری و چاودێریكردنی منـداڵەكەیان لەم دە شەو و رۆژەدا زۆر پێویـست و گـرنگە. كەواتە شـەوارە هەرچـەنـدە نەریتێكـی بـاو و جـوانی كوردەوارییە، بە پێی ئەم بۆچـوونەی پزیشـكەكـان گرنگـی و سوودی خۆی هەیە.

بـەڵام هەستیشیان بـەوە نـەكـردووە، كـە هـات و هـاوار و گـۆرانی بـە دەنگـێكی بـەرز، زیـانێكی زۆر بـە مێشكـۆلـەی ناسـكی ئـەو كـۆرپـەلە تـازە لەدایكبووانـە دەگـەیەنێت.

بەداخـەوە، شۆڤێنی عـەرەبی، كە زۆر رەگـەزپەرسـت و دڕنـدە و نـامەرد و بێویـژدانن، كـارێكی ئەوتـۆیـان بەسـەر گەلـی كوردمـان هـێنان، كە تـا ئەمـرۆ سـتەم و نـامەردی وا لە هیـچ گەلـێكی تـر، لە هیچ شـوێنێكی جیهـاندا نەكـراوە.. نـزیكەی پێـنج هـەزا دێهـات و شارۆچـكەی باشـووری كوردسـتانیان وێرانكـرد، ویستیان چـی داب و نەریـت و بەهـای پیـرۆز و رەسـەنمان هەیە، چ فـۆلكلۆر و كەلەپـوورێكی نەتـەوەییمان هەیە، لە رەگەوە هەڵیان بكێشن.. ویستیان شـیرازەی خـێزانی و ژێرخـانی كـۆمەڵایەتی كوردیمـان بەجـاری هەڵبتەكێنن، ویستیان بە جاری قـڕمان بـكەن و ناسنامەی نەتەوەییمـان بـسڕنەوە، نــاوی كـــورد و كوردســـتان لە بـــوون و ژیـــاندا كوێـــرەوەبكەن.. سیاســـەتی (زەوی ســـوتاویان) لە كوردســـتان دا

پەیڕەوی کـرد. بە کـورتی ئەمڕۆشـی لەگەڵـدابێت، ئەم داگـیرکەرە درنــدە و ڕەگەزپەرسـتانە، گەر دەسـتیان بــڕوات هەمــان نیــازی گڵاویـان هەیـە و درێـژە بـە هەمان سیاسـەتی شۆڤێنی دەدەن لە دژی کــورد و کوردســتانی نیشتمانمان.. بــەڵام لــە ســایەی خەبـات و خۆڕاگری و کۆڵنەدان و قوربانیدانی بێوێنەی گەلی کوردی دلێر و قارەمانمــان، لە ســایەی زیــاتر ســووربوونمان لە تێکۆشـــان و بەرگـریکـردن لە کوردســتانی پیــرۆزمان، هەمــوو نیـاز و پـیلانە گـڵاو و قێزەونەکانی داگیرکەرانـی کوردسـتان شکستیان هـێنان و شکست دەهێنن.. چونکە کورد لە مردنیش بەهێزتـرە.. لە پـۆلاش ڕەقتـرە، کـورد هەر مـاوە هەر دەمێنێت و هەرگیزیش دەستبەرداری خاکەکەمان و مافە ڕەواکـانمان نابین.

داوا لە نەوەی نوێی دایکـان و باوکــان دەکەین، بە تــایبەتیش داوا لــە گوندنشینەکـانمان دەکەین.. کە نەهـێڵن نــەم داب و نەریتە جـوان و ڕەسەنــانەی کوردەوارییانەمــان، کــاڵ ببــنەوە و کوێـرەوەبـن.. بــا "شـەوارە" بــاوی بێـتەوە و بە شـێـوەیەکی مۆدێـرن درێــژە بــەم نەریتـە کوردەییەمــان بدەیـن، بـە مەرجێـک لـە شێوازە ڕەسەنـەکەی لانەدەین.

# لای لایــه بەشێکە لە ئەدەبی منداڵان

(لامارتین) دەڵێت:"جوانترین هونــراوە لە سەرانسەری جیهــاندا، لای لایــەی دایکــانە"دایکــانی بەســوز، هەمیشە هەوڵــدەدەن، کە بە خوشیــیەوە کورپەکــانیان بــکەنە خــەو، بە دەنگێکــی ناســک بە ناوازێکی شیرین لای لایە و لورین و گورگانە شەونیان بو دەڵــێن.

لای لایــە بەشــێکی گــرنگە لە ئەدەبــی منــداڵان و لە کەلەپــووری فولکلوری هەر گەلێک. هەر گەلێکیش تایبەتمەنـدی خوی هـەیە، بەڵام هەمـوو دایکـان لە هـەموو جیهـاندا، لە سـوز و خوشەویستی و دڵـسوزی و میهرەبانیــدا وەکــوو یەک وان.. ئەم خوشـەویـستی و سوزەش رەهەکین لە لای دایکانی مروڤ و لە لای دایکـانی هەموو گیانەوەرانی تـردا.

دایکــانی کــورد لە لای لایەکردنــدا جیــاوازن، بەوە ناســراون کە خاوەنی دەنگێکی ناسک و ناوازێکی شیرینن. ئەمەش لەوەوە هـاتووە کە دایکــانی کوردمــان زور بە ســوز و دڵوڤــانن و خــاوەنی خوشـەویـستیی و هەســتێکی قــووڵن.. لای لایــەی کوردیمــان هەمەرەنگـیە لە کوردســتان دا، لە دیالـێکـتێکەوە بــو دیالـێکـتێکی تـری زمـانی کـوردی، لە دەڤەرێکەوە بو دەڤەرێکی تـر، تا رادەیەک کەمێـک جیاوازییـان هـەیە، بەڵام لە نــاوەروک و ســوود و مەبەسـتدا هەمـوو لای لایــە و لــورینە کوردییەکــان هاوبەشــن. هەمووشــیان رەســەنایەتی و مــورک و شەقــڵ و تایبەتمەنــدی کــوردی و کوردســتانییان پێــوە دیــارن، ئەم فــرە دیالێکتیــک و لــق و بەشــە

دیالێکتیکـانە، لە راسـتیدا کێـشەن لە رێـی دروسـتبوونی زمـانی ستانـــداردی یەکگرتـــووی کوردیـــدا، بەڵام هۆکارێکیـشن بـــۆ دەوڵەمەندیمان لە فۆلکۆری کوردیمـان، بـۆ دەوڵەمەنـدیمـان لە لای لایــەی هەمەجـــۆرە و لە گۆرانییەکـــانی دایکـــانی کوردمـــان.

گەر بە وردیش سەرنجی فۆلکلۆری کوردیمان بدەین، ئەوەمـان بۆ روون دەبێـتەوە، کە لـــێوان لێـــوە لە لای لایـــە و لاوانـــدنەوە و پیاهەڵـدان و بـە سـەدان گـۆرانی دایکـانمان بـۆ منـداڵانی کوردمـان هـەیە.. ئەم جۆرە هونـەرەش بە جۆرێکی وەهـا بەرفـراوان لــە نـێو خەڵکـیدا بڵاوبـووەتـەوە، سیمایـەکی میللیان وەرگرتـوون.. هـۆی ئـــەم بەرفراوانیـــیەش دەگەڕێـــتەوە بـــۆ ســـووک و ئاســـانی هۆنـراوەکـانی لای لایـە و بـۆ شیرینی ناوازەکـانیان و بۆ خـۆشی سەداکـــانیان و بـۆ کاریگەریـیان و بـۆ گواستنەوەیــان لە نەوەکـانی پێشەوە بۆ نەوەکـانی دوای خۆیـان. لە ئەمڕۆشدا ئینتەرنێت رۆڵێکی گـــرنگی هەیە لە بڵاوکـردنەوە و پاراستـــنی لای لایـــە و هەمـــوو لقەکـانی رۆشنبیری و ئـەدەب و هونـەر.

لای لایـە و لـورین و گورگـانە شەوێ و پیاهەڵـدان و لاوانـدنەوە و گۆرانییەکـانی دایکـانی کوردمـان پانتاییەکی فراوانیـان لە فۆلکلۆری کوردیمـان گرتـووەتەوە. بەشـێکی گرنگیـشن لە ئـەدەبی منـــداڵانی کوردمان، بەشێکی گـرنگیشن لە فۆلکـلۆر و کەلەپـووری رەسـەنی کوردیمـان.. بـێ زیـادەڕۆییش، گـەلی کوردمـان لـە ریزبەنـدی هەرە پێشەوەی گـەلانی جیهان دایە، لە دەوڵەمەنـدی لە لای لایـە و لە گۆرانیی فـۆلکلۆری دایکـان بۆ منـداڵان.

لای لایـــە و لوریـــن و لاوانـــدنەوەی دایکـــان، لە مێـژەوە لە نـــاو کولتـوور و فـەرهـەنگی نەتەوەکانـدا بە تـایبەتیش لە نـاو کولتـوور و

فەرهەنگی گەلی کوردمان لە کوردستان دا، بە شێوەی زارەکی، دایکان لە دایکانیان و لە نەکانیانەوە وەریان گرتوون، نەوە لە دوای نەوەی گەلەکەمان وەکوو نەدەبێکی سەرزارەکی وەریان گرتوون تا گەیشتوونەتە نەوەی نەمڕۆمان. بەڵام بە هۆی نەنووسینەوە و تۆمارنەکردن و بە ئەرشیف نەکردنیان، یا بە هۆی ناوڕلێنەدانەوەی بەشێکی زۆری دایکانی ئەمڕۆمان، بەداخەوە بەشێکی زۆری لای لایە و لورینی کوردیمان لەبیرچوونەتە و لەناوچوون یا خەریکە لەناوبچن.. بۆیە پێویستە بیان نووسینەوە و بە ئەرشیفیان بکەین و بیان پارێزین.

لای لایە و لورین و لاواندنەوەی دایکان بۆ کۆرپەکانیان، لاواندنەوەیەکی سروشتین و لە خۆوەن، زۆر جار یەکسەر ئیلهامی هونراوەکان بە خەیالی دایکاندا دێن و دیانڵێن. ئەمەش بۆ قووڵی هەست و سۆزداری دایکان دەگەڕێنەوە، کە لە پڕێکدا لە ناخیاندا سەرهەڵدەدەن.. بێگومان کانگا و کانیاوی لای لایە و لورین و گۆرانی منداڵان، دڵی پڕ لە سۆز و بەزەیی و خۆشەویستیی قووڵ و بێسنووری دایکانە.

لای لایە دایکان بۆ کوڕان و کچان، گەلێ وشەی ناسک و شیرین و ڕەسەنی کوردی و جوانترین وتەکانی سۆزداری و خۆشەویستییان لەخۆگرتوون و واتایەکی قووڵ دەبەخشن، کە دایکان بە شێوازێکی هونەریی ناوازدار و بە دەنگێکی نەرم و ناسک دەیانڵێنەوە، لای لایە بەوەش ناسراوە کە موزیکێکی خاوە و چێنە دەنگییەکانی نزمن.

لای لایەی دایکان بۆ منداڵەکانیان بە یەکەمین قوتابخانەی جیهانی منداڵان دادەنرێت، کە منداڵان گوێیان لە جوانترین وشە و ناسکترین ئاواز و شیرینترین سەدا دەبێت.

گۆنیەکانیشیان بە وشە و رستەی دروست و ناسک و شیرین رادێنن و دەبنە یەکەمین وشە و رستەکانی فەرهەنگی زمانیان.. ئەم لای لایانەش سروشتین و گوزارشتن لە دڵسۆزی و خۆشەویستی و لە هەست و سۆزداری ناخی دایکان بۆ جگەرگۆشەکانیان.

لای لایە یا لە راستیدا بڵێین گۆرانییەکانی تایبەت بە منداڵان، هەر وەکوو دایاکان لە هەموو شوێنێکی جیهاندا بڕوایان وایە، ئەم زمانە شیرین و سادەیە کە منداڵان لێیان تێدەگەن و پێیان ئاشنادەبن، ئەو ئاوازانەن کە منداڵان پێویستییان پێیان هەیە کە گوێبیستیان ببن، تا خەو بیان باتەوە، یا کاتێ کە پێدەگرن گۆرانی پێگرتنیان بۆ دەڵێن.

مێژووی لای لایە دەگەرێتەوە بۆ مێژووی پەیوەندی دایک بە منداڵەکەیەوە لە دروست بوونی گەردوون و مرۆڤەوە، رەنگە لای لایەی دایکان سەرەتای دەستپێکی زمان بێت.

هونراوەکانی لای لایە و لورین بە زۆری لە دانانی خودی دایکانن، بەڵام چەندین کەڵە شاعیری ناسراوی جیهانیش هۆگری ئەم جۆرە هونراوەیە بوون و لای لایە و لورینیان بۆ منداڵانی هۆنیوەتەوە وەکوو (شکسپیر، لۆرکا، بایرۆن، کیتس، رۆبیرت، یوهان فەردریک ریتشارد، دی ڤالا، هێنریک نوردبرانت، فەروغ فەروخزاد،... هتد) لە شاعیرە ناسراوەکانی کوردیشمان، کە لای لایە و لورینیان نووسیون (ئەمین عالی بەدرخان، فایق بێکەس، هەژار موکریانی، قانع، مەلا ناوارە سەردەشتی، مینە جاف، ...هتد) چەندین ئاوازدانەری بە توانای ناسراویش ئاوازیان بۆ داناون، چەندین هونەرمەندی گۆرانیبێژیش بە دەنگە خۆشەکانیان لای لایە ولورینیان تۆمارکردوون. بەڵام ئەمە

راستییەکە و نکوولی لێناکرێت، کە چڕینی لای لایە بە دەنگی ناسک و شیرینی لێوان لێو لە سۆز و خۆشەویستیی دایکان، چێژێکی تایبەتی و کارتێکەرێتێکی زیاتری لەسەر دەروون و هەستی منداڵان هەیە.

(بیتهۆڤن) دەڵێت:" ناسکترین ئاواز و شیرینترین میلۆدی، تەنیا دڵی دایکان دەیزانن"لە بنەڕەتیشدا، لای لایە و لورین و گۆرگانەشەوێ لە ناخی دەروونی دایکانی دڵۆڤانەوە سەریان هەڵداوە، پێناسەی لای لایەش هەر بە دایکانەوە گرێدراوە. کاتێ کە باس لای لایە دەکەین واتا باسیش لە دایکان دەکەین.

هۆنراوەکانی لای لایە و لوری ئاوازدار و کێشدارن، بە زۆری لەسەر کێشی رەسەنی کوردیمان (بڕگەیی) هۆنراونەتە، کە شێوەی نیمچە هۆنراوە و پەخشان نامێزیان هەیە..هەندێکیشیان لە خانەی هۆنراوەدا ریزبەندی دەکرێن.. هۆنراوەکانی لای لایە کێشدار و سەرواداری، بە زمانێکی سادە و ساکار دارێژراون. گۆرانییەکانی لای لایە هێمن و ناسکن، ئاوازەکانیان شیرینن، تڕپەکانیان رێکن، لەگەڵ تڕپە و لەرینەوەی راژەنینی لانک و بێشکە هەڵوەرکدا گونجاون. چێژ و خۆشی و کارتێکردنێکی زیاتری لای لایە و لوری، بەندە بە قووڵی هەست و بە گەرم و گوڕی و بە دەنگ خۆشی و بە سۆزی لایلایەبێژانەوە. ئەو نافرەتانەش کە لای لایە بۆ منداڵان دەکەن، دایکان و نەنکان و خوشکی گەورە و دایەنەکانن.

کچان لە دایکانیانەوە گوێیان لە لای لایە و لوری دەبێت و وەریان دەگرن. کە بوون بە دایکان ئەوانیش بۆ کۆرپەکانیان ئەم لای لایانە دەکەن.. لای لایەش بە پێی سەردەم و کات و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و دەروونی دایکانی لایلایەبێژەوە دەگۆڕێن. گەلێ لای

لایەی و لوری تازەمان هەیە کە دایکانی ئەمڕۆمان یا شاعیران دایان ناون. دەقی بەشێکی زۆری لای لایە و لورییە فۆلکلۆرییە ڕەسەنەکانیشمان وەکوو خۆیان نەماونەتەوە، دایکانی لایلایەبێژ یا هونەرمەندانی گۆرانیبێژ، دەستکارییان کردوون و وشە و کۆپلەی تازەیان بۆ زیادکردوون یا وشە و ڕستەیان لێیان لابردوون.

لای لایە و لوری لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر مەرگوازرێنەوە و دەپارێزرێن. لە ئەمڕۆدا بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و داهێنانی ئامێری تازەی ئاسانکاری، بە هۆی نووسینەوەیان بە داتە، لای لایە و لورییەکانمان خێراتر و فروانتر بڵاودەبنەوە و دەپارێزرێن. بە پێویستیشی دەزانین کە لای لایە بخرێتە بەیرە و پرۆگرامەکانی پەروەردەیی و ببێت بە بابەتێکی پەرتووکەکانی خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلەکانی قوتابخانەی بنەرەتی، تا ببێت بە پردێکی بەیەکگەیاندن لە نێوان ڕابردوو و داهاتوودا. تا ڕۆڵەکانیشمان ئەم ڕاستییە بزانن "ئەوەی ڕابردووی نەبێت داهاتووشی نییە"

گەرچی ناوەرۆکی ئەم لای لایە و لورینانەی دایکان جیاوازیان هەیە، بەڵام مەبەستی سەرەکی هەر هەموویان ژێرکردنەوە و خافڵاندن و هاندانی منداڵەکانیان بۆ ئەوەی بە خۆشی و بە ئارامی و بەبێ ترس بنوون.. ئەمەش خواست و هیوای هەموو دایکانە. (سوزان ئیزاکس) دەڵێت:"دایک دەبێت ئەوە بزانێت، کە ئەو چەند خولەکەی پێش نووستن لەگەڵ منداڵەکەیدا بەسەری دەبات.. منداڵەکەی وا هەست دەکات کە دایکی لە هۆشی دایە و تاریکیش ناتوانێت بیترسێنێت و قووتی بدات".

# دەربارەی واتای لای لایە

وشەی (لای لایە) لە دووبارەکردنەوەی فرمانی داخوازی (لای) یەوە پێکهاتووە، کە لە دووبارەکردنەوەیدا، پیتە بزوێنی (ە) خراوەتە سەر کۆتایی دووەمیان.(لای) فرمانی داخوازییە واتا (لال) یا (بخەوە) یا (بنوە) کە دایکان یا لایلایەبێژان بەم فرمانە داخوازییە (لای) داوا لە کۆرپەکانیان دەکەن کە بنوون. ئەم وشەیە (لای) بۆ سووک و ئاسانی و نزیک لە زمانی منداڵانی کۆرپەوە وتراوە. واتە هاوماناى فرمانی داخوازیی (لای لایە)،( بنوە بنوە) یا (بخەوە بخەوە) یا (لال لال)ە، کە دایکان بە لای لایە داوا لە کۆرپەکانیان دەکەن کە ژێربینەوە و نەگرین و چاولێکنێن و بخەون. (لای، لال، لوری) هاوماناى فرمانی داخوازیی (سلیپ)ە، لە زمانی ئینگلیزی دا. (لای لایە، لایە لایە، لای لای، لایلایە، لاوە لاوە، لوری لوری) ئەم وشانە هاومانان و دەتوانین هەموویان لە لای لایەکردندا بەکاریان بهێنین.

لای لایە لە زمانی ئینگلیزی دا پێی دەڵێن (لوللابی) یا (کاردلە سۆنگ) لە زمانی عەرەبیش دا (الهدهدة) یا (اغاني المهد) یا (اللیلولة) عەرەبەکانی عێراق بە زۆری (دللول)ی پێ دەڵێن کە بە زۆری بە (لولای ) دەست پێدەکات، لە فارسی دا (لالا) یە. ئازەری (لای لای)، عەرەب (دللول)، فارس (لالا) هەرسێکیان لە وشەی (لای لایە)ی کوردییەوە وەریان گرتووە.

لای لایە لە ناو فەرهەنگ و هونراوەی هەموو زمانەکانی گەلاندا، تایبەتمەندی خۆی هەیە، کە گوزارشت لە داب و نەریتی ئەو گەلانە دەکات. هەر قوناغێکی مێژووییش تایبەتمەندی خۆی هەیە. دەتوانین لە ڕێی لای لایەوە ڕادەی ڕوشنبیری گەلان پێناسە بکەین. بەڵام سەرەڕای تایبەتمەندییەکانی هەر گەلێک لە لای لایەکانیاندا، هاوبەشی و تێکەڵییەکیش لە نێوان لای لایەی گەلاندا هەیە.. هەندێ جار وا دەردەکەون، وەکوو ئەوەی کە لە سەرچاوەیەکەوە هاتووبن.

ئامژە بە نووسینێکی گرنگی نووسەر (د. مونعید عەبدولستار) دەدەین، کە لە بەرواری (٥/نۆڤەمبەر/٢٠٠٧) لەژێر ناونیشانی (ترانیم الاطفال واغاني الامهات، دللول العراقية، كرديه ذات اصول مشتركة مع الانگيزيه) کە لە سایتی (کلکامش) دا بڵاوی کردۆتەوە، بەپێی نووسینەکەی دکتۆر مونعید:"بە ناوبانگترین لای لایە لە ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا (دللول)ە، کە بەرانبەر بە (لای لایە)ی کوردییە. دایکانی عەرەبی عێراقی بە زۆری سەرەتای گۆرانییەکانیان بۆ کردنە خەوی منداڵەکانیان بە ( دللول یالولد یابني دللول) دەستپێدەکەن. دایکانی کوردیش بە زۆری بە (لای لایە کۆرپەی شیرینم لایە) دەست پێدەکەن.. زۆربەی لای لایەکانی تریش لەم سەرەتایانەوە دەستیان پێکردوون. گەر بڕوانینە ڕەگ و ڕەسەنی (دللول)ی عەرەبی، هاوبەشە لەگەڵ وشەی (دل) یا (دڵ)ی کوردی. لە دیالێکتی کرمانجیی باکووردا، گۆرانی ( دلو دلو ) کە بە دیالێکتی کرمانجیی باشوور "دڵم دڵم"ە بە ناوبانگە. لە لوڕی و فەیلیش دا (لالو) یا (لالو بکە) واتە بنوە کە بە شێوەی فەرمانی داخوازی، تەنها بە منداڵ دەوترێت (لالوبکە) واتا بنوە.

وشەی (دل)ی کوردی بە شێوەیەکی فراوان چۆتە نێو گۆرانی عەرەبییەوە بە تایبەتیش لە مەقامات دا، وشەی (دلم) یا (دلي دلي) لە زۆر دەستپێکی مەقام و گۆرانی عەرەبی لە عێراقدا بەکارهێنراون، کە هەمان وشەی (دل : دل) کوردییە. مەقامبێژانی عەرەب دان بەم راستییەدا دەنێن و ناتوانن هاشای لێبکەن کە کارتێکردنی گۆرانی کوردی لەسەر مەقامات و گۆرانی عەرەبی لە عێراقدا بە زەقی دیارە و ناشارێتەوە.

لای لایە لە هەندێ لە زمانەکانی جیهاندا: لە (کوردیدا: لای لایە) لە( ئینگلیزیدا: لولا لولا) لە (ئەڵمانیدا: لیا پۆ پیا) لە (ئیسپانیدا: نا نا) لە ( رووسیدا: بایۆ بای) لە (ئیتالیدا: نینا نانا) لە (عیبریدا: نومي نومي) لە (پورتوگالیدا: نانا نانا) لە (لاتینیدا: نیا نیا) لە (یۆنانیدا: نانی نانی) لە (رۆمانیدا: نانی نانی) لە (عێراقیدا: دللول دللول) لە (عەرەبیدا: نم نم) لە (فارسیدا: لالا لالا) لە (نازەریدا: لای لای) لە (تورکیدا: نەنی نەنی) لە (ئەفغانیدا : لالی لالی).. وشەکان لێیەکەوە نزیکن. هەموو ئەو وشانەی زمانەکان، فرمانی داخوازین دوا لە کۆرپەکانیان دەکەن کە بنوون.

هەر(دکتۆر مونعید عەبدولستار) دەڵێ: تێبینی ئەوەش دەکەین کە کە لێکچوون لە نێوان لای لایەکاندا هەیە، بۆ نموونە لە یەکتر نزیکی لای لایەی عەرەبی و عیبری لە (نم) و (نومي) دا، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ رەگی هاوبەشی زمانی هەردوکیان.. هەروەهاش لێیەک نزیکی سەدای (لولا لولا)ی ئینگلیزی لە (لای لایە)ی کوردییەوە، چونکە رەگێکی هاوبەشی زمانیان هەیە.. سەیریش نییە کە زانایەکی بەریتانی، پێی وابێت کە لە (سەدا حەفتا)ی وشە ئینگلیزییەکان بە رەسەن سۆمەرین.

نـاوەڕۆکی لای لایـە و گۆرانییەکـانی منـداڵان، هـیوا و نـاوات و خۆزگە و ئارەزووەکانی دایکـانی کوردمانی لەخۆگـرتوون.. گەر بە وردی شـرۆڤەی لایـلایەکانی دایکـان بکەیـن، ئەوەمـان بـۆ دەردەکەوێت، کە ئەم لای لایـانە پڕن لە مانا و ئامۆژگاری و پەند بۆ منداڵان و بۆ کۆمەڵگـای کوردیمـان، کە چۆن دایکـان لە میانـەی ئەو لای لایانـەوە گـوزارشـت لە سەختی ژیـانیان و لە کوێـرەوەری و مەینەتییەکانیـان دەکەن، هـیوا و ئاواتەکـانیـشیان بە داهاتـووی کۆرپەکانیـانەوە گـرێ داون. لای لایـەی دایکـان بە هەر زمـان و ئاوازێک بوترێن، دەبینین هەمـوو دایکان بە دەوری ئـەم واتایانـەدا دەسووڕێنـەوە، کـە بـە کـورتی لـەم خاڵانـەدا چـڕمان کردوونەتەوە:

١ـ نووستن پێویستییەکی سەرەکی مـرۆڤە، بە تـایبەتیش منـداڵان پێویـستییەکی زیاتـریان بە نووسـتن هەیە.. بـۆیە دایکـان داوا لە کۆرپەکانیـان دەکەن کە بنـوون.. نـزاش دەکەن و لە یـەزدان و لە پێغـەمبەران و لە فریشتەکـان و لە هەمـوو پیاوچاکـان دەپـاڕێنەوە، کە منـداڵەکـانیان بـە هـێمنی و نـارەمی و بـە خـۆشی و شـادییەوە بنـوون، پاسەوانیان بن و ئاگـایان لێیان بێت و بیان پارێـزن.. نـزای ئـەوەش دەکەن کە تەنـدروستی منـداڵەکانیان بـاش بێـت و تەمەنیـان درێـژبێـت و نەخـۆش نـەکـەون و هـەرگـیز مـەرگـیان نەبیـنن و جەرگیـان نەسووتـێت، شـەونخوونیان بە فـیڕۆ نەچێـت و لێیـان بـێ ئومێد نەبن و رەنجیان بـە فیڕۆ نـەدەن.. بـە زوویـش گـەورەبـن و خزمـەتی گەل و نیشتمانەکەیـان بـکەن.

بە هـۆی بـوونی ئاینی جۆراوجۆر لە کوردستان دا، هەر ئاینێـک بە بـڕوا و بە شـێوازی خـۆی دەپـاڕێتەوە و داوا لە یەزدانـی مەزن دەکـات.. سـەرەڕای لای لایـە کـردن بە چەنـد دیـالێکتـێکی

جیاوازی زمانی کوردی، بەڵام ریتمی لای لایەکان هەمان ریتمن.

٢ـ بەڵێن دانی دایکان بۆ دڵخۆشکردنی منداڵەکانیان، گەر بنوون دیاری و پاداشتیان پێشکەش دەکەن. دوایی دێینە سەر ئەو بەڵێنانەی کە دایکان بە کورپەکانیان دەدەن.

٣ـ ترساندنی منداڵان گەر نەنوون، بە درندە و گیانەوەری خەیاڵی و نەفسانەیی، یا بەو ناژەڵانەی کە لە ژینگەکەیان دا هەن وەکوو: دێو، جنۆکە، شەوە، شومقار، گورگ، کەمتیار، چەقەڵ، ریوی، سەگ، پشیلە، کەڵەشێر، مانگا،...هتد (گورگانە شەوێ).

٤ـ دەربڕینی سەرسامی بە منداڵەکانیان، باسکردنی خەسڵەتەکانیان و خۆشەویستییان.

٥ـ پێشبینیکردن و هیواخوازیی داهاتوویەکی باش و گەش بۆ منداڵەکانیان.

٦ـــ دەربـــڕینی هەســـت و ســـۆز و خۆشەویستی دایکـــان بـــۆ منداڵەکانیان، هەستی دایکان هەستێکی تایبەتی بێوێنەیە، هەردەم منداڵەکانیان لایان شیرینن و لەبەر دڵانیانن.

٧ـ دایکان لە میانەی لای لایە و لورین و لاواندنەوە. راز و گلەیی و گازندە لە پێچ وەمۆرکردن و لە سنووردارکردنی نازادییان دەکەن، باسیش لە ژیانی تاڵی پڕ لە نازار و لە نەهامەتی و مەینەتی و کوێرەوەری و لە ژیانی دوور لە هاوسەری و رۆژگاری سەختی خۆیان دەکەن.. ئەم ناخۆشی و مەینەتییانەیان دەکەنە هەوێنی ناوەرۆکی لای لایە و لاواندنەوە بۆ کورپەکانیان.. بە لاواندنەوە و گەرمەشین، بە ناوازێکی غەمگین دەریان دەبڕن..

هەروەکوو (کلیپتسا) دەڵێت:" بۆ ماوەیەکی درێژخایەن نافرەتانی ڕۆژهەڵات کۆیلەی نێو خێزان و کۆمەڵگە بوون"

٨- جار و بار لای لایەی دایکان ڕەخنەئامێزن و بە تونیکڵن، تانە و توانجی ڕامیارییان لەخۆگرتوون، یا بۆنی شۆڕشگێڕنەیان لێدێن، یا سەرکۆنەی ستەم و زۆرداری دەکەن.

ماوەی قۆناغی نێو لانکیش لە دوو هەفتەوە تا دوو ساڵ و نیوە، کە بە قۆناغی شیرمەژ یا (شیرخۆر) ناودەبرێت، لەم قۆناغەدا منداڵانی شیرخۆر بۆ مەستبوونیان لە پێویستی و پێداویستییەکانیان بە تەواوی پشت بە کەسانی تر دەبەستن، بە تایبەتیش پشت بە دایکانیان دەبەستن، تا ئەو کاتەی کە دەتوانن پشت بە سەربەخۆیی خۆیان ببەستن، لە میانەی فێربوون و کۆنترۆڵکردن و زاڵبوونیان بەسەر ماسوولکەکانیاندا، ئەو کاتە خۆیان خواردنەکانیان دەخۆن، فێری ڕۆیشتن و قسەکردن و یاری دەبن، فێری کۆمەڵێک وشە و دەستەواژە و ڕستەش دەبن.

هەر لەم قۆناغەشدا، کاردانەوەیان بۆ ترپە ڕێکەکان دەبێت، کە لە لێدانەکانی دڵی دایکانیانەوە ئاشنایان بوون، کە دایکانیان دەیان خستنە سەر دڵیان و هەستیان بە هێمنی و نارامی دەکردن، هەروەها بەو ترپە ڕێکانە و بەو ئاوازانە ئاشنان دەبن، کە دایکانیان بە لای لایە و لوری و لاواندنەوە بۆیانیان دەچڕن. توێژینەرەکان لای لایە و گۆرانییەکان بۆ منداڵان لەم قۆناغەدا، دەکەنە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: لای لایە و لوریی ناراستەکراو بۆ منداڵانی کۆرپە: لەم چەشنە سترانانەدا دایکان هیوا و ئاوات و خۆشبەختی و داهاتووگەشی و جوانی و جوامێری و نازایەتی و..هتد. بۆ کۆرپەکانیان دەخوازن. ئەم لای لایە و لوریيانەش بەپێی رەگەزی منداڵان لە کوڕانەوە بۆ کچان و بە پێی پێگەی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێن.. لای لایەکان پەیوەندیان بە خواندنی منداڵانەوە هەیە.. گۆرگانە شەوێش بەشێکە لەلای لایە.. ناوەرۆکەکانی ئەم لای لایە و لوریيانە، زیاتر بە سەدا و بە گەرم و گوڕی لایلایەبێژەکانەوە بەندن. منداڵانی ئەم قۆناغە، هێشتا فێری زمان نەبوونە. لە واتاکانی وشەکانی لای لایە تێناگەن، بەڵام چێژ و خۆشی لە ناواز و ترپە و لە سەرواکانی هۆنراوەکان وەردەگرن.

بەشی دووەم: ئەو لای لایە و لوریيانەن کە ناوەرۆکێکی پێکەناوییان هەیە (جەفەنگێن) بۆ منداڵانی تەمەن ساڵ و نیوی تا دوو ساڵان.. لەم تەمەنەدا منداڵان تا رادەیەک لە ناوەرۆکی لای لایەکان تێدەگەن.

بەشی سێیەم: گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن کە بە (نەش نەش) یش ناودەبرێن، پەیوەندییان بە هەڵپەڕاندن و یاری لەگەڵ کردن و ختووکەدان و پێگرتنی منداڵانەوە هەیە. کاتێ کە منداڵان سەرپێ دەکەون و دەکەونە پێرەوکە، هەردوو دەستەکانیان دەگرن و بۆیان دەڵێن:(تاتی.. تاتی.. یا خوا بەخێر هاتی) یان (دارە دارە.. پێ بگرە بەهارە) لای لایە بێ بناغە نییە، گوزارشتە لە خۆشییەکان و لە ناخۆشییەکانی مرۆڤ، کە لە پەیوەندییەکی پتەوی ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵک و نۆخی رۆژگارەوە سەرهەڵدەدات.

(تۆلستۆی) دەڵێت:" گەر بناغەی کارێک تێبگەیت، بەشەکانی سەر بناغەکە روونتر دەبن و تۆڕی سایکۆلۆژیای مرۆڤ تێدەگەیت..

نەستەمە مرۆڤ لە لای لایە نێرینەکان چێژ وەربگرێت، یان کاری تێبکەن، گەر شارەزای ماڵە جووتیاری کوخ نشین نەبێت و ژنە جووتیاری بەر ناگەردان نەبینێت، کە لە سەرێکەوە بە دەم تەشی رستنەوە، لانک بە پێیەک رادەژێنێت و زریان بەسەر ماڵە نوغرۆکەیدا هەڵدەکات، لە سەرێکی دیکەوە سیسرکێک گاز لە منداڵەکەی دەگرێت. تەنیا رووناکی ژیانیشی نەو ترووسکە کزەیە کە لەسەر بزووتی ناکامی رەژوو هەڵدێت، هەرچی هێما و بزووتنەوەکانی ناوەوەی لای لایەیە لەم راستییانەوە سەرهەڵدەدەن"

# مێـژووی لای لایـە

مێـژووی لای لایە زۆر کۆنە، لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ بوونی مرۆڤ و پێکهێنانی خێزان لەسەر گـۆی زەویـدا، بـۆ دروستبوونی پەیوەنـدی نێـوان منـداڵان و دایکـانیان، لە هـەر کونێیـەکی دنیـادا منـداڵان هـەبن، دایکـانیان لای لایـە و گـۆرانیان بـۆ دەڵـێن گەر بە مـەزە مـزکردنیشبن. لای لایـە بە چەنـدین قۆناغی مێژوویی دا تێپەڕیوە، لە هەر قۆناغێکیـشدا بە پێـی بـارودۆخی دەوروبەرەکەیـان و ئەو رۆژگـارانەی کە تێیانـدا ژیـاون، تایبەتمەنـدی خۆیـان وەرگرتـوون، سەرهەڵدانی ریتم و ئاواز لای مرۆڤ لە داهێنانی زمانیش کۆنترە.

دوور لە زیـادەڕۆیی، بە بەڵـگەوە و لە چەنـدین سـەرچاوەی بیانیشدا، دان بەم راسـتییەدا نـراوە، کە دایکـانی کوردمـان لە کوردسـتان دا، یەکەمین کەسن کە لای لایەیان داهێناون. کـۆنتـرین لای لایـەش لـە هەمــوو جیهانــدا، کە تــا ئەمــڕۆ دۆزراویتــەوە.. لای لایـەیـەکی کـوردییە، کـە بـە زمـانی (ئـاڤێستـای پیرۆز) نـووسـراوە، زمـانی ئـاڤێستـاش زمـانی مـادی یە، واتـای (ئـاڤێستا : بنـاغـە و بنیاتنـانی بەهێـز) دەڵێن لەسەر پێستی دوانـزە هـەزار مانگـا نووسـرابۆوە. زەردەشــتی پێغەمبــەر، ئـاڤێـستـای بــەو زمــانە نووسیــوە. (مێجەرسـۆن) یـش جەختـی لەسـەر ئەوە کـردووە، کە سـەرچاوەی زمانی کوردی، زمانی مـادی یە.. ئاینی زەردەشتیش ئـاینێکی زۆر کۆنـە و زۆریش لەو مێژووانـەش کۆنـترە کە لـە هەنـدێ بـاس و لێکۆڵینەوە و سەرچـاوەدا ئاماژەیـان پێداون. بێجـگە لـە کـورد، چەند

نەتەوەیەکی تریش لەسەر ئەم ئاینە بوون، وەکوو، فارس و هیند.

مێژووی ئەم لای لایە کوردییەمان بۆ زیاتر لە (چواردە هەزار ساڵ ) بەر لە ئەمڕۆ دەگەڕێتەوە.. پرۆفیسۆر دکتۆر (فاروق سەفی زادە بۆرەکەیی) دەقی ئەم لای لایە کوردییەی بە پیتی ئارامیی کوردی لە ژمارە (٥) ی ساڵی (٢٠١١)ی گۆڤاری مانگانەی (ئاناهیتا) دا بڵاوکردۆتەوە. پرۆفیسۆر فاروق سەفی زادە ئەم لای لایەیشی لە زمانی دایکە (مینا ئیزدمهر بۆرەکەیی)ی ئەمەرەوە وەری گرتووە.
ئەمەش دەقی ئەو لای لایە کۆنە کوردییەمانە، کە بە زمانی مادی یا (ئاڤێستا) وتراوە:

رۆڵە لای لایە ، کۆرپەم لای لایە
نازانم بۆچی دەنگت دەرنایە

ئەشیمە و وهوو وەهیشتەم ئەستی
ئووشتا ئەستی یە ئووشتا ئەهمایی

هی یەت ئەشایی وەهیشتای ئەشیم
یەتا ئاهووودە تی ری یو ئەتها

رەتووش ئەشاتە چیت هەچا یەتا
وەنگە هو ئەشا دەزدا ئامەنەنگ

شیوس ئەمەتە ئەنگ هواشە مەزدا
هی یەت ئەشایی وەهیشتای ئەشیم

خشـــتەری میچـــا نـاهــــــورایـی نـــا
یـیــم درگـو پــی یـو ئەدمت راســــتاریـم

رۆلــــە لای لایــە ، کـورپـــەم لای لایـــە
گـوێ بگـرە لە من ، دەنــگی یەزدایـــە

هـی یەت ئـەشـایی وەهیشـتای ئـەشـــیم

دەقــی ئــەم لای لایەیــە بـەم، شـێـوەیە وەریــان گـێـڕاوە بـۆ ســەر زمـانـی فـارسـی:

فـرزنـــــــــدم لالا ، دلبــــــندم لالا
نمی دانـم چرا صدایت درنمی آید

راسـتی و داد بهـــــترین اسـت
پـــــاکی خوشـــــــبختی اسـت

خوشبەختی برای کسی است کە راستی

و داد را برای راستی و داد انجام دهد
همان گونە کە خـداونـد راستی و دادگـری اسـت
راهـبـر دنـیـایی نیز بـر پـایـە راسـتی و دادگـری بـرگـزیـدە شود
این دوو با کـردرها و انـدیشـە (وهـومـن) بـرگـزیـدە مـی شـوند
تا همە کردارها، از روی نیکی و راستی و خرد انجام دادە شوند
هـمان گوونە کە خداونـد راستی و دادگری اسـت
و راسـتی دادگری در همە جـا خـود را بنمـایـاند
و نیـک کرداری ، با نیروی اهوارایی پروش یابد
و بـە یـاری نـاتوانـــان و نـــــاداران بشـــتابد
فـرزنـــــــــــــدم لالا ، دلـبـــــــــــــندم لالا

گوش به من بسپار ، صدای خداوند است
همان گونه که خداوند ، راستی و دادگری است

وەرگێرانی ئەم لای لایەیە، لە فارسییەوە بۆ سەر زمانی کوردی بە دیالێکتی کرمانجیی باشوور ـ سۆرانی، بەم جۆرەیە.

رۆڵە لای لایە ، کۆرپەم لای لایە
نازانم بۆچی دەنگت دەرنایە

راستی و هەق چاکترین دیارییە
ناکاری باش بەختەوەرییە

خۆشبەختی بۆ کەسێکە راست و دادپەروەربێت
تەنیا راستی و داد ئەنجامدەربێت

هەر بە شێوازی خوداوەند راست و دادپەروەربێت
رابەری دنیاییش راستی و داد هەڵبژێرەربێت

ئەم دوانە بەکردار و ئەندێشەی چاک (وەهومن) هەڵدەبژێررێن
تا هەموو کردارەکان بە چاکی و راستی و ناوەزەوە ئەنجام بدرێن

هەر بەو شێوازەی کە خوداوەند خۆی راست و دادپەروەرە
راستی و دادپەروەری لە هەموو شوێنێ خۆی بنوێنێت

کرداری چاک بە هێزی ناهوورایی پەروەردە بێت
بە هەتای بێ توانایان و نەدارەکانەوە دێت

رۆڵە لای لایە کۆرپەم لای لایە
گوێ لە من بگرە، دەنگی خودایە

کێشی ئـەم لای لایەیـەش بە زەمـانی ئاڤێستا، کێشێکی کـۆنی کـوردیی ئــەو ســەردەمەی کوردســتان بــووە، کە بە کێــشی (گـاتـاھـاست) ناوبـراوە، کە کێشێکی فۆلکـلۆری کوردی کـۆن بـوو. زۆربــەی گۆرانیـیە فۆلکلۆرییــە کوردییەکـانی کۆنمــان لەسـەر ئـەم کێشە ھۆنـراونەتـەوە: (تـەنــەن تــەن تــەن تـەنــەن تــەن تـەنــەن).

شـایەنی باسیشە ئـەم لای لایـەیە کوردییە، وەکــوو سروودێــک لە نـوێژە ئاسـرەوەکـانی (زەردەشتییەکـان) و (میـھرییان) دا، لە زەمـانی ئاڤێستا و لە زەمان گەلـێکی زۆر کۆنـەوە بە یادگاری بــە جـێماون. مەبەستیش لە گەلێکی زۆر کۆن گەلی کوردمانە. کە کۆنتـرین گــەلە لە ھەمـوو ڕۆژھەـڵاتـدا.

لە خـوارووی عێراقیشـدا، کۆمەڵێـک لای لایــە دۆزراونەتـەوە، کە لەســەر تاتــە قــوڕی سوورەوەکــراو، بە (نووسیــنی مێــخی) نووسراون، مێـژوویان دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی سۆمەرییەکـان. لای لایـەی سۆمەرییەکـان، لە منـداڵ دەپـاڕێنەوە کە بنوێت، ھـەروەکوو لە ھۆنـراوەی (شولگی سەنتی) ی ھـاوسەری شا (شـولگی) دا ھاتووە، کە لە بنەماڵەی سێیەمی (ئـور) بوو، کە بۆ کوڕە نەخۆشەکەی داینـاوە. دایکـانی سـۆمەری وەکــوو ئەوەی کەمــوا بـاوبــوو، داوایــان لـــە کـوڕەکــانیان ناکــرد، بەڵکــو بــە زۆری داوایــان لـــە خـــەوی دەســەڵاتــدار دەکــرد و لـــێی دەپاڕانــەوە، کــە بچێــتە چـــاوی کوڕەکـانیانەوە، بـە ھیوای ئەوەی بە نارامی و خۆشییەوە بنوون.. ھەروەکوو لـەم لای لایەیـەدا دەردەکـەوێت، کە مێژوووکەی بۆ (پێنج ھەزار) ساڵ بەر لە ئەمڕۆ دەگەڕێتـەوە.. دایک لەم لای لایـەیەدا، ئاوا

لە خـودی خەو دەكـات و لێـی دەپـاڕێتەوە، كە بێـت و كـۆرپەكەی بخەوێنـێت، دەڵـێت:

نـەی خـەو وەرە، وەرە نـەی خـەو
وەرە دەبینی كە كۆرپەكەم ڕاكشاوە
نەی خـەو خێرا سەرمان لێدە كوڕەكەم بـزێـوە
وای لێیكە كە چاوە لێكنـاوەكانی بنووقێنێت
دەستـت بخـەرە سـەر چـــاوە كلـكـراوەكـانی
دەربـارەی زەمـانێشی كە لـە دەنـگ نـاوەستێت
بیگـرە و لـێی مەگەڕی كە چـاوەكـانی هەڵبێـنێت

دایكە سۆمەرییەكە لەسەری دەڕوات و لای لایە بۆ منداڵە نەخۆشەكەی دەكات و بەڵێنی دەداتـێ كـە خـەو دێـت و گـۆشی پـڕ لـە شـیرینی و لـە پەنـیری خۆمـاڵی و كـاهـوی تـازە دەكـات، كـە لـە بـاخچەكـە كـراوەتـەوە، لـە نەخـۆشییەكـەت چاكـت دەكـاتەوە:

خـەو گـۆشت پـڕ لە شیرینی دەكـات
منیش پارچـە پەنیرە بچووكەكـانت بـۆ شیریـن دەكەم
نەم پارچە بچووكانە پیاوانی گەورەش چاك دەكـاتەوە

لە لای لایـەكی تـری سۆمـەریـدا، دایـكـێك كـوڕە منـداڵـەكەی دەدوێنـێت و دەڵـێت:

ژنێـك بـۆ كــوڕەكەم دەخـــوازم
كوڕێـكی هـەڵــكەوتووی دەبێـت
خـزمـەتـكـــارە جــــــوانـەكە
تێشـــكی منـداڵـەكەی دەگـــرێت
لە مەمـكەكانییەوە شیری دەداتـێت

شایەنی باسیشە، بەپێی چەندین بەڵگە و توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی مێژوویی، ساغ بۆتەوە و جەختت لەسەر نەوە دەکەن، کە سۆمەرییەکان بە رەچەڵەک کورددن و لە پێشا لە ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان ژیاون، دوایی بە هۆی سەختی کەش و ناوهەواوە، بەرەو دەشتاییەکانی خوارووی عێراق رەویان کردووە و نیشتەجێبوون. گەورەترین و پێشکەوتووترین شارستانییان بنیات نا. بۆ یەکەمین جاریش بە دەیان داهێنانیان داهێنا. گرنگترین داهێنانەکانیان (نووسینی مێخی) یە، کە بە سەرەتای قۆناغێکی مێژوویی نوێ و بە وەرچەرخانێکی گرنگ و بە شۆڕشێکی داهێنان و پێشکەوتن دادەنرێت.

# ئەو هونەرمەندە كوردانەی لای لایەو لانكۆلێ یان وتووە

پێمان خۆشە ناوی ئەو هونەرمەندە گۆرانبێژانە و لایلایەبێژانەمان لەم پەرتووكەدا بنووسین، كە لای لایە و لورین و لانكۆلێ یان بە دەنگ و بە ئاوازەوە بۆ منداڵان وتوون و تۆماریان كردوون. داوای لێبووردنیش لەو لایلایەبێژانە و لانكۆلێ بێژانەش دەكەم، كە لای لایە و لورین و لانكۆلێ یان وتوون و ناوەكانیانیان بەرچاوی ئێمە نەكەوتوون و ناوەكانیان لە نێو ئەم ناوانەدا نین.
ناوی لایلایەبێژان و لانكۆلێ بێژان:

(محەممەد مامەلی، مەزهەر خالقی، خەلیل سدیقی، ناسر رەزازی، حەسەن زیرەك، مەرزییە فەریقی، حەمە جەزا عەلی، بێژەن كامكار، سەحەر لوتفی، حیشمەتوڵلا لورنەژاد، فەتانە وەلیدی، سەعید گلباری، حەمە حوسێن كێمنەیی، رەفیق چالاك، نەیاز یوسف، دایكە دەولەت، گولسیفێن مەدار، لۆكە زاهیر، جەلال سەعید، تارا جاف، عەزیز مامەلی، كامەران عومەر، محەممەد فەخری، سەحەر زێیلی، مەهدی عەباسی و مینا دەریس، لەیلا فەریقی، پشتیوان نەورۆزلی، پەروین شازادە، نوری باریكەیی، شەهرام نازری، كارین ـ پێلستانگ، سەیوان گاگلی، كەیهان كەلهوڕی، فەرزاد فەریدی، غەزەل مستەفا، شادی غولامی، سیما بینا، مەلا حوسێن عەبدولڵا زادە، موحسین لورستانی، شێنێ، مەهدی جوانرۆیی، نەمیر عەلی، دیمەن، عەلی محەممەد نەرسەلان، كاروانی نەی، دەریا دادڤار، رەزا نەزەری، مەهدوخت وەزیری، كامكار نەمیری، زانا عەبدوڵلا، پەری زەنگەنە، یوسف عەبدی حوسێن، نیلیان

ناليا، مەسعود جەليليان. گرووپی کوردان يارسانی، جەلال حەسەنپوور، سمايل ماملی، فەرمان نەورۆزلی، کەتايۆن،...هتد) جگە لەوەی کە بە دەنگی چەندين دايکانی دەنگخۆشی کوردمان، لای لايە و لورين و لاواندنەوە وتراون. بەڵام ناوەکانيان و لای لايە و لورينەکانيان تۆمار نەکراون.

# سوودەکانی لای لایە بۆ منداڵان

دایکان و باوکان و کەسانێکی کەم ئەوە دەزانن، کە سوودەکانی لای لایەی دایکان بۆ منداڵەکانیان، لە رووی دەروونی و جەستەیی و گەشەکردن و فێرکردن و فێربوونەوە، زۆر زۆرن و نایەنە هەژمارکردن و جوغزهێنان بە دەوریاندا.. چەندین لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و تاقیکردنەوەی پراکتیکی و مەیدانی، کە لە لایەن شارەزایانی دەروونی منداڵان و لە لایەن پزیشکانی پسپۆری دەروونی و نەخۆشییەکانی منداڵان ئەنجام دراون، هەر هەموویان جەختیان لەسەر بایەخ و سوودەکانی لای لەیەی دایکان بۆ منداڵان کردوون.. تا ئەو رادەیەی کە لای لایەی دایکان بە هێورکردنەوەیەکی نەفسوناوی و بێوێنە دەزانن.. بە کورتی و بە چڕی لەم خاڵانەی خوارەوەدا، گرنگترین سوودەکانی لای لایەی دایکان بۆ منداڵان، ریزبەند دەکەین، بەو هیوایەی دایکان و باوکانی ئەمڕۆی کوردمان و دایانگاکانی کوردستان سوودیان لێوەربگرن:

١ـ لای لایەی دایکان، بە قوتابخانەی یەکەمی جیهانی منداڵان دادەنرێت، بۆ گوێگرتن لە جوانترین وشە و لە ناسکترین میلۆدی و لە شیرینترین دەنگ.. هەر لە کۆرپەییەوە گوێیەکانی منداڵان بە وشە و بە قسەی خۆش رادێن.. گریان و نوزە نوزیان دەگۆڕێت، بە زەردەخەنە و پێکەنین و دڵی دایکان و کەسانی دەوروبەریان خۆشدەکەن، بە نارامی و هێمنی و بێترس دەنوون. ئەمەش هێناتەدی ئامانجێکی سەرەکی لای لایەی دایکانە.

٢ـ لە توێـژینەوەیەکی پراکتیکـیدا، کە لە لایەن پەیمانگـای پزیـشکی ئەمریکـاوە ئەنجـام دراوە، لای لایـەی دایکـان، پەیوەنـدییەکـی تونـدوتـۆڵ لـە نێوان دایکـان و منداڵانـدا دروست دەکـات. واش دەکات کە منداڵان بـڕوا و متمـانەیەکی زۆریـان بە خۆیـان هەبێت.

٣ـ لە لای لایـەدا، سـۆزداری و خۆشەویـستیی دایکـان، تـێکەڵ بە نـاخی ویـژدانیان دەبن، کە بەهـای مرۆڤایەتییان لێ بەرجەستە دەبێت. دایکان بە چەند کۆپلە لای لایەیەکی کێش و سەرواداڕ، گـوزارشت لە خواسـت و لە هــیواداریی‌یەکانیان بــۆ کۆرپەکــانیان دەکەن، کە بە نارمی بنوون و تەندروست بن، تەمەن درێـژبن، داهـاتوویەکی بـاڵا و گەشیان ببێت.

٤ـ لای لایـەی دایکــان، بە خۆشــترین گـۆرانییەکــانی منــداڵان دادەنرێـت، کە دایکـان بـە شێوازێکی بلیمەتانە و بە زمـانێکی شیرین و ناسـان دایـان دەرێــژن، گەرچـی لە سەرەتــادا منــداڵانی سـاوا لە واتـای وشەکـان و لە مەبەستی لای لایەکـان تێ ناگـەن، بـەڵام چێژ و خــۆشی لە رتــمی دەنــگ و لــە نـاوازەکــانی لای لایەکـــان وەردەگــرن.. خەیـاڵ و هـۆش و سەرنجـیان رادەکێشن، هۆگـر و ئاشـنایان دەبن.. وشەکـانیش لە بیریانـدا کۆدەکەنەوە.

٥ـ دایکــان لە لای لایــەدا، بە زمــانێکی شـیــرینی هەنگـوێـنـی، هەستی ناسـک و سـۆزی قـووڵ و خۆشەویستی بێـپایانی خۆیـان بـۆ جگەرگۆشەکانیان دەردەبڕن. کۆرپەکانیشیان هـەست بـەوە دەکـەن، کە جـێی بایـەخـدانی دایکـانیان و نـازیـان هەڵدەگـرن و خۆشـیان دەوێــن.. ئەم هەســت و تێگەیـشتنەی منـــداڵانیش لە وشەکـــانی دایکـانیان، لـە گوزارشتی دەموچـاو و لە رووگەشـی و چـاوگەشی و زەردەخەنەی سەر لێوەکانیان و لە بـزواندنی دەســت و پێیەکـانیان و

لە جــوولەی جەســتەیان و لە رواتینەکـــانیان، لە چەپڵەلـــێدانیان و لـە جۆرەکـانی گرۆگـاڵەکـانیادا دەردەکـەون.

٦ـ لای لایـە، بـە هـۆی مـوزیـکی نـاوەکی و هـارمـۆنیەتی تایبـەتی خۆیــەوە، لە رەوتــی پــەروەردە و فێربـوونــدا، کـاریگەرییــەکی دیــاری و بەهێـزی هـەیە.. بەشـداریش لـە دروستکـردنی کەسایـەتی دروسـت و هـاوسەنگی منـداڵان دەکـات.

٧ـ لای لایـەی دایکـان، لـە رۆشـنبیریی سـەر زارەکــی کـوردیــدا زۆر بـڵاوە، لای لایـە بایەخـێکی گەورەی رۆشـنبیری و نـەتەوەیی و کۆمەڵایـەتی و میـژوویی هــەیە، بەهــایەکی گــرنگی دەروونـــی و رەوشـتی و رەفتاریشی هـەیە.

٨ـ لای لایەی دایکــان، منــداڵان زیـرەک و هـێمن دەکـات.. دەبێتە هـــۆی فـــراوانی بـــوون و گەشەکـــردنی مێـــشکی منـــداڵان.. هاوکـارێکی باشیشە بـۆ زاخـاودانی مێشک و خەیـاڵ و زەیــنی منـداڵان.

٩ـ لـە لێکۆڵینەوەیەکـدا کـە لـە لایـەن زانـکۆی (میـامی) یـەوە ئەنجـام دراوە، هــەوڵی ئەوەیــان دا، کــە بایــەخی ئەم رافــتارە پەروەردەییە بـاوە و رۆڵـی کارتێکردنی لەسـەر منـداڵان بـزانن.. هۆی ئـەوەش بزانـن کـە بـۆ هەمـوو دایکـان هـەر لـە خۆیـانەوە لـە قۆنـاغی شیـردانـدا، لای لایـە بـۆ منداڵـە کۆرپـەکانیـان دەکـەن؟ خلتووی پرۆفیسۆر (شانـۆ دولیـتوال) چاودێـری ئەوەی کـرد، کە بەراوردێک لە نێوان کاردنەوەی لای لایـەی دایکـان لەسەر منداڵانی کۆرپە لەگەڵ کاری چیرۆک خـوێندنەوە لـە پەرتـووکێکی وێنـەدار، یـا یـاریکـردن بـە بـووکـەڵــە لـە گــەڵ منداڵانــی ســاوادا، چ کــاردانەوەیەکی جیاوازیـــان هەیە. لە پـــاڵ ئەمەشـــدا، تـــوێژێنەر

پرۆفیسۆر شانۆ بەراوردی کاردانەوەی لایە لایەکردنی دایکان بۆ منـــداڵەکانیان و لای لایەکـــردن بـــۆ هەمـــان منـــداڵان لە لایەن کەسانێکی نامۆوە، یا گوێکرتنی منداڵانی ساوا، لە هەمـان لای لایـەی تۆمارکـراو لەسـەر کاسێت یـا سیدی. کارتێکـردی ئەم تاقیکردنەوەیش لەسەر (٧٠) منداڵانی کورپـە ئەنجام درا.. رێـژەی هـەرە زۆری منداڵانی ئەم تاقیکـردنەوەیە، تەنـیا چـێژیان لە دەنگەکـانی دایکـانی خۆیـان وەردەگرتـن، کـاردانەوەکانیشیان بـۆ دەنگەکـانی دایکـانیان بـوون. هـەر بەپێـی ئەنجامەکـانی ئـەم لێکۆڵـینەوەکە کە لە گۆڤـاری (نـارتس نـین سیکۆسـیر نیـی) دا بڵاوکـراوەتەوە، کە لای لایـەی دایکـان بـۆ کورپەکـانیان یارمەتی چارسەرکـردنی خەمـۆکی دایکـان لە دوای منـداڵ بـوونیان دەدات. ئـەم خەمـۆکییەشیان نـاگوازرێتـەوە بـۆ منداڵەکـانیان و کـاریشیان تێناکـات. لێکۆڵـینەوەکە گەیشتە ئـەو ئەنجـامەش کـە لای لایـەی دایکـان بـۆ منداڵـە کورپەکـانیان یارمـەتی خۆشکـردن و شـیرین کردنـی پەیوەنـدیی تایبەتی نێـوان دایکـان و منـداڵان دەدات. ئەنجـامەکـان هـانی دایکـان دەدەن کـە لای لایـە بۆ منداڵە بچووکەکـانیان بکـەن، گرنـگیش نییە کـە دەقەکـانی لای لایەکـانیـان هەرچییەک بـن.. بە لای لایەکـانیـان رێ لـە خـەمـۆکی منداڵەکـانیـان و لـە خـەمۆکی خۆیـان لـە دوای منداڵ بـوونییان دەگـرن.

١٠ـ لای لایـە رەنگـدانەوەی ئەو هەسـت و سـۆز و خـرۆش و خۆشەویستی و خۆشی و ناخۆشـی و راستییانـەن کە لە ناخی دایکـان دان.. زۆر جـار دایکان لە لای لایەکانیان دا، گـوزارشت لە ئۆخـی دەروونـی خۆیـان و لە ئۆخـی خێـزانی و کۆمـەڵایەتیـیان دەکـەن، گوزارشت لە کوێـرەوەری و مەینەتی و بەدبـەختی و لە نازارەکـانی

خۆیـان دەکەن، کە لەوکـاتەدا تێـیدا دەژیـن.. پـەردە لەسـەر گـەلێ لایـەنی کۆمـەڵایـەتی لادەدەن.. چیـرۆکی سـەختـی و تـاڵی ژیـانی خـۆیـان دەگێڕنـەوە.. یا هیوا و خـەون و نـەو راز و نیـازانەی کە لە خەیاڵیان دان، هەڵیان دەڕڕێـژن و ئاشـکرایـان دەکـەن.

١١ــ لاوانــدنەوە بە زۆری غەمگــینە، هەنــدێ جــار دایکــان بە لاوانـدنەوە گلەیی و گازندە لە هاوسەرەکانیان یا لە خەسووەکـانیان یا لە رۆژگــاری تـار و ناڵەبــار دەکەن، یـا لەگەڵ راژەنیـنی لانکـی کۆرپەکانیانـدا، بە کـوڵ گەرمەشـین دەکەن و بـۆ تـازە مردووە نازیز و خۆشەویـستەکـانیـان دەلاوێنــنەوە. دایکــان بــە لای لایــە و لاوانـدنــەوەی بەکـوڵ، دڵــیان دادەکەوێـت. نـارامی و هـێمنیش بە بارگـرژی و سوێ و کەسەر و نـازارەکـانیان دەدەن.

١٢- لای لایـە یارمەتی منـداڵان دەدات، کـە ئـاشـنـای کەلەپـووری نەتـەوەکـەیان بـبن، لــە دووتــوێی لای لایەکـانــدا، گـەلــێ بیــر و بەهــا و جـوانییان لەخـۆگـرتـوون، وەکـوو رێـزگـرتـن لــە گـەورە، پەیوەنـدی خـێـزانی، شـێـوازی رەفتارکـردن لەگـەڵ منـداڵانـدا.

١٣- لای لایە و لاواندنەوە و گۆرانی و موزیک و سەدای شـیرین و هەڵبەرانــدن و یــاری لەگــەڵ کــردن، نەک تەنیــا منــداڵان هــێوردەکەنەوە، بەڵکـو نــازەڵانیش هێـوردەکەنــەوە و خۆشـییان پێدەبەخشن.. بەڵام چـێژ و خۆشیـەکی زیاتر بە منـداڵانی کۆرپـە دەبەخــشن، گەشــە بە توانــا زانــستییەکـانیان دەکەن و جووڵــەکانی نەندامەکــانی لەشــیان زیــاتر دەبــن و ماســوولکەکانیان زیاتــر گەشـەدەکەن و پتەوتــر دەبـن، تەنــدروستی گـشتیان باشـتر دەبێـت، زووتـر فێری گـرۆگـاڵ و قسەکـردن دەبن، زووتریش شـارەزایی زمانیان پێـدەبەخشن.

١٤ـ هەنـــدێ لە دایـەنگــا تازەکــانی وڵاتـــانی ئەوروپـــا، لەوانەش ئەڵمانیـا سـوودیان لە لای لایــە وەرگــرتوون، بە دەنــگی دایکــان لەسـەر کاسێت و سیدی و میمۆری لای لایەیـان تۆمارکـردوون، لە ژوورەکانی منـداڵانـدا بۆیـانی لێدەدەن.. ئەم تاقـیکردنەوەیە ئــەوەی سەلماند کە لای لایـە بە دەنگی دایکان بۆ منداڵەکـانیان کاردنەوەیەکی ئەرێنییان هەیە.

١٥ـ لای لایەکـان، پشـت بـە دووبـارە و تـرپـە ساکـارەکـانی ئــەو وشـانــە دەبەسـتـن، کە خەیـاڵی منـداڵان رادەکێشن. لە دوای هــەر کۆپلەیەک یا چەند دێرێک واژەی لای لایـە دووبـارە دەکـرێتەوە.. مەبەستیش لە دووبارەکردنەوەی (لای لایــە)، جەخـت کــردنەوەی داوای دایکانە لە منداڵەکانیان کە بنـوون، منداڵەکـانیشیان هەست بەوە دەکەن دایکانیان لایانـن و جـێیان نەهێشتوون و ئێشکیان دەگــرن.. دووبـارەکــردنەوەش، زیاتــر منــداڵان بـــە دەنـــگی دایکـانیـــان ئاشنـایـان دەکـات.

١٦ـ هەندێ لــە لای لایەکـان، شۆڕشگێڕانە و رامیارین. هــیوا و ئامانجی نیشتمانییان لەخۆگـرتوون. یـا بە هـۆی بەرگری لە خـاکی کوردستانی نیشتمانی شیرینمان، باوکـانێکی زۆر پێـشـمەرگـەن و مـاوە مـاوە لـە هـاوسـەر و لــە منـداڵەکـانیان دادەبـڕێن.. یـا شەهـید بـــوونە، ئەم دابـــڕانانە کـــارتێکردنی لەســـەر هاوژینەکـــانیان و منـداڵەکـانیان هـەیە، لــە لای لایـەکـانیـانـدا رەنگـیان داوەتــەوە.. دایکـان بـۆ تەنـیایی خـۆیـان دەکـڕووزێنـەوە.. لــە هەمـان کاتیشـدا شانـــازیش بەوەوە دەکــــەن کە هـاوسەرەکــــانیان پێــشـمەرگـەن و بەرگـــــری لە کوردســـتان دەکەن. ئاواتەخــــوازی ئەوەشـــــن کە کۆرپەکـانیشیان زوو گـەورەبن و بێـنە کایــەوە و وەکوو باوکانیـان بــبن بە پێــشمەرگە، گەر لە پێـــناوی پاراستـــن و بەرگــــریکردن

له کوردستان شەهیدیشبن دایکانیان سەربەرزن و شانازییان پێوەدەکەن. گوشکردن و پەروەردەکردنی منداڵانی کوردمان بە کوردستان پەروەری ئەرکێکی پیرۆزی دایکان و هەموو کوردێکی دڵسۆز و کورد و کوردستان پەروەرە.

١٧ـ هەندێ لە لای لایەکان رەخنەئامێزن دایکان لە لای لایەدا، ئەوس و تانە و پلار لە داگیرکەرانی رەگەزپەرستی کوردستان دەگرن. کە بە بەندکردن و بە کوشتن و لە سێدارەدان و کیمیاباران و ئەنفالکردن و بە رەشەکوژی و ژینۆسایدە، وەڵامی مافەکانی کوردیان داوەتەوە و دەدەنەوە.

١٨ـ لێکۆڵینەوەیەکی تازە ئەوەی ئاشکراکرد، کە لای لایەی دایکان، سەرەرای ئەوەی کە منداڵان دەکەنە خەوێکی هێمن و خۆش، یارمەتی منداڵەکانیشیان دەدات کە هەر نازارێک هەستی پێدەکات، لە بیری بەرێتەوە و نەمێنێت.

١٩ـ لای لایەی دایکانی کوردمان، هۆکارێکی گرنگە بۆ گواستنەوەی زمانی دایک زمانی شیرینی کوردیمان، بۆ پاراستنی داب و نەریت و ناسنامەی نەتەوەییمان.

٢٠ـ بە پێی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە لە نەخۆشخانەی (گریت نورمۆند ستریت) لە بەریتانیا، پزیشکەکان بۆ ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لە سێ ساڵ کەمترە، لای لایە و گۆرانییان بۆ دەوتن و ئامادەیان دەکردن بۆ ئەوەی بە نەشتەرگەریی دڵیان بۆ بچێنن.

ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەیە لەگەڵ ئەنجامی دوو تاقیکردنەوەی تردا بەراوردکران، کە بۆ دوو کۆمەڵە منداڵانی تر هەمان نەشتەرگەرییان بۆ کردن، کۆمەڵەی یەکەمیان گوێیان لەو چیرۆکانە گرت کە پزیشکەکان بۆیان دەخوێندنەوە، بەڵام

کۆمەڵەی دووەمیان، کە زۆربەی کاتەکان بە تەنیا جێیان دەهێشتن.

لە ئەنجامی ئەم سێ تاقیکردنەوەیەی لەسەر ئەو سێ کۆمەڵە منداڵانە کران، گەیشتن بەو ئەنجامەی، کە منداڵانی ئەو کۆمەڵەیەی گوێیان لە لای لایەی و لە گۆرانی گرت، لەوانەی تر کەمتر نازاریان هەبوو، لێدانی دڵیشیان زیاتر رێکتربوون.

ئەم ئەنجامانە، بوون بە پاڵنەر بۆ ئەو زانایانەی کە سەرپەرشتی ئەم لێکۆڵینەوەیان دەکرد، ئەوەیان بۆ ساغ بۆوە کە چارەسەر بە لای لایە و موزیک کاریگەرە و هیچی تێناچێت دەکرێت وەکوو هۆکارێکی چارەسەرکردن لە نەخۆشخانەکان پشتیان پێببەستن.

٢١ـ پزیشکەکانی منداڵان، ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە گۆرانییەکانی دایکان کە بە لای لایە ناودەبرێن، یارمەتیی ئەو منداڵە نەبەکامانە (ناتەواوانە) دەدەن کە لە پێش تەواوکردنی (نۆ مانگ) لە دایک دەبن، لای لایەکان یارمەتییان دەدەن کە بە خێرایی چاک ببنەوە. پزیشکەکان ئامۆژگاری دایکان دەکەن، کە لای لایە بۆ کۆرپەکانیان بکەن. چونکە ئەم لای لایانە هۆکارێکی یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی منداڵە نەبەکامەکانیان بە زوویی لە کێشە تەندروستییەکانیان چاک ببنەوە.. پزیشکەکان جەختیشیان لەسەر ئەوە کردوە کە دەنگەکانی دایکان یارمەتی ئەم منداڵە نەبەکامانە دەدەن، گەر لەگەڵ شیرپێدانی منداڵەکانیاندا، لای لایەی ناوازداری تربە رێکی گونجاویان بۆ بکەن. یا لەسەر کاسێت و سیدی و میمۆری، لەسەر دەزگایەکی تایبەتی دا تۆماربکرێن، بۆ چارەسەرکردنی دۆخی ئەم منداڵە نەبەکامانە سوودیان لێوەردەگرن. بەلام گەر وانەبێت، منداڵانی شیرەخۆر لە کاتی شیر خواردندا، شیرخواردنەکەیان

بە دەنگی دایکانیانەوە گری نادەن.. ئەگەر بەرێکی لای لایەکان لەگەڵ تریە و ئاوازەکانیان بسازێنرێن، ئەم منداڵانە بە شێوەیەکی باشتر گەشە دەکەن و گەورە دەبن، ئەو ئێش و ئازارانەش کە دووچاری بوونە، کەمتر دەبنەوە.. بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی تازەش، کە بە وردی سەرپەرشتیی تەندروستی ئەم منداڵە نەبەکامانەیان دەکردن، زووتر نەخۆشخانەکانیان بەجێدەهێڵن.

هەر بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو منداڵانەی کە چاک بوونەوە، رۆژی (١٥) خولەک بۆ ماوەی (٥) رۆژ ئەم تاقیکردنەوەیان لەگەڵیاندا ئەنجام دان.. تێبینی ئەوەشیان کرد کە ئەم منداڵە لە دایکبووانە (١٤) رۆژ زووتر لە ماوەی دیاریکراو بۆ مانەوەیان، نەخۆشخانە بە جێدەهێڵن، بەراورد بەو منداڵە نەبەکامانەی کە دایکانیان لای لایەیان بۆ ناکەن، یا لای لایە تۆمارکراوەکانی بە دەنگەکانی دایکانیان بۆ لێنادرێن. ئەم لێکۆڵینەوەیەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لای لایەی دایکان، چ چارەسەرێکی سەیرە، چ دەرمانێکی دەگمەنە بۆ چارەسەری نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکانی کۆرپەکانیان.

# نموونەی لای لایەلە
# هۆنراوەکانی شاعیرانی کورد

### ئەمین عالی بەدرخان (١٨٥١-١٩٢٦)

محەممەد ئەمین عالی بەدرخان، باوکی (سورەیا و جەلادەت و کامەران بەدرخان)، کە بە زۆری بە (ئەمین عالی بەدرخان) ناسراوە. کەسایەتییەکی ناوداری گەلەکەمانە، تێکۆشەر و کورد و کوردستان پەروەرێکی سەرسەخت و ناسراوە. هەموو ژیانی بۆ ناساندن و بردنە پێشەوەی دۆزی کورد و بۆ هێنانەدیی مافە رەواکانی گەلی کوردمان تەرخان کرد. ئەمین عالی بەدرخان، سەرەڕای ئەوەی کە سیاسەتمەدارێکی گەورە بوو. دەستی هۆنینەوەی هۆنراوەشی هەبوو، چەند هۆنراوەیەکی بۆ لاوان و منداڵان بە زمانی کوردی هۆنیونەتەوە و بە پیتی لاتینی بڵاوی کردوونەتەوە. لە پێشا بە ناوی خوازراوی (زینو) وە، بڵاوی کردوونەتەوە، دواتریش بە ناوی تەواوی خۆیەوە بڵاوی کردوونەتەوە. لەوانەش هۆنراوەی (دەلالیا زاروان) واتا (نازی منداڵان) کە لە ساڵی (١٩٠٦) دا لە شاری (ئەسپارتە) ی یۆنانی نووسیویەتی، چونکە باوکی لەسەر چالاکیی کوردایەتی و کوردستان پەروەری، عوسمانییە رەگەزپەرستەکان، دووریان خستەوە بۆ یونان. کە لە ژمارە (٦) ی گۆڤاری (کوردستان) دا، لە (٢٢-٤-١٩١٩) دا، بڵاوی کردۆتەوە. هەمان هۆنراوەی لە ژمارە (٥) ی گۆڤاری (هاوار) لە (٢٠-٧-١٩٣٢) دا بە هەمان ناونیشان (دەلالیا

زاروان) دا بڵاوکردۆتەوە، کە لە دیمەشق بە کوردی و بە عەرەبی دەردەچوو. سەرنووسەرەکەشی (میر جەلادەت بەدرخان) بوو.

ئەمین عالی بەدرخان، هۆنراوەیەکی تری بۆ منداڵان هۆنیوەتەوە، هەر لە گۆڤاری هاواردا، بە ناونیشانی (لوریا بەدرخان) واتا (لاواندنەوەی بەدرخان) بڵاوکردۆتەوە، کە لە شێوازی لای لایە و لاواندنەوە دایە. دەشێت بۆ (کامەران بەدرخان) ی کوڕە بچووکی هۆنیبێتەوە.

دەقی هۆنراوەی (لوریا بەدرخان) و واتای دێڕەکان لە (بەرگی یەکەم) ی (ئەدەبی منداڵانی کورد) نووسینی مامۆستا (حەمە کەریم هەورامی) یەوە وەرم گرتوون.

لوریا بەدرخان

بنەڤە خوە شێیا دل و دوو چاڤان
دادی ژ تە هەر روو نەگەهبان
دا زوو مەزن ببی بەدرخان
بنەڤە کەزیا من بنەڤە لۆ لۆ
* * *
هشیار مەبە نەهۆ نە قنجە
مە هندک ژ تەرا بزانە گەنجە
بێخەو مەبە بلشێیا وێ رەنجە
بنەڤە کەزیا من بنەڤە لۆ لۆ
* * *
خۆشحالی وەکی کەڤۆک و بەرخان
فدکرانێدنا تە مەلەک ژ حەیران
پاکە نەسەبا تە دادێ قوربان
بنەڤە کەزیا من بنەڤە لۆ لۆ

* * *

دەروا فەلەك لەسەر مەكينە
بەختێ مە رەشە كەزەب برینە
مەسكەن ژ مە رەڤەو بڤینە
بنەڤە كەزیا مەن بنەڤە لۆ لۆ

* * *

نە مال و نە ساغ و نە راحەت
تالان كرنە هەمی ژ میحنەت
دەشوارە گەلەك بەلایێ غوربەت
بنەڤە كەزیا مەن بنەڤە لۆ لۆ

* * *

چەرخا فەلەكێ وەكی نەسیمە
هۆ نا بە خوە دێ گەلەك رەحیمە
رۆژا خۆشیێ دبت كەریمە
بنەڤە كەزیا مەن بنەڤە لۆ لۆ

* * *

هەوقەلسی تو و مەبێژە نەڤ چ حالە
بێ سەبر مەبە وطێ مە نالە
عەون كەرما خوەدێ هەڤالە
بنەڤە كەزیا مەن بنەڤە لۆ لۆ؟

دەڵێت:

- بەدرخان كزەی جەرگم بنوو.. رۆژێ دەبێت گەورە ببێت.
- لانك بۆ تۆ جێگەی نارامە و بە ناگا مەیی با نەزانی چ باسە.

- وەكوو كۆتر و بەرخان وەها بە.. مەزانە مەسەلە چییە دەنا سەرگەردان دەبیت.

ـ فەلەک قینی لە ئێمەیە، ئەوە نییە، بەختی ئێمەی رەشکردووە و بریندار کردووین و رێ و شوێنی ئێمە نابینێت.

ـ تووشی میحنەت و بەڵای غەریبی کردین.. هەموو شتێکمان بەتاڵان برا و خۆشی و حەواندنەوەمان نەما.. بنوو کزەی جەرگم بنوو .

- چەرخی چەپگەرد وەک بای شەماڵە وەبزانە خوا بە جۆرێکی تر وەری چەرخان. ئەوکات رۆژی خۆشی دێت و خوا کەریمە.. بنوو کزەی جەرگم بنوو.

ـ قەلس و بێ سەبر مەبە و مەناڵە، مەڵێ ئەمە چ حاڵە، خوا چاوی لێمانە و لەگەڵمانە. بنوو کزەی جەرگم بنوو..

## لای لایەی فایق بێکەس (١٩٠٥ـ١٩٤٨) بۆ (شێرکۆ)ی کوڕی

شاعیری کورد و کوردستان پەروەرمان (فایق بێکەس)ی ئەمر خاوەنی سروودی (خوایە وەتەن ئاواکەی) و هۆنراوەی (ئەی وەتەن) و (بیست و حەوت ساڵە) و چەندین هۆنراوەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی.. بۆ (شێرکۆ بێکەس)ی کوڕیشی ئەم لای لایە جوان و پڕ لە مەبەستەی هۆنیوەتەوە، هیواخوازی ئەوەش بووە کە شێرانە بێتە ناو کایەوە.. خۆزگەکەی هاتەدی شێرکۆ بێکەس بوو بە کەڵە شاعیرێکی کورد و کوردستان پەروەری ناودار و بەرهەم نایاب.. ئەمەش لای لایەکەیەتی بۆ شێرکۆ:

رۆڵە لای لایە ، شێرکۆ لای لایە<br>
شەوگار درەنگە بۆچ خەوت نایە<br>
دنیا کش و مات لە هەموو لایە

هەرچی درەخت و دەشت و چیایە
وا لە ژێر باڵی ڕەشی شەوایە
نە دەنگ نە سروە هیچی لێ نایە
ڕۆڵە لای لایە ، شێرکۆ لای لایە
یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە
* * *
بنوو بە خۆشی تا بەیانی
خەوی ژێر پەردەی پاکی یەزدانی
گریانی چیتە ، تۆ چی دەزانی؟
تۆ تازە خونچەی باخی ژیانی
کورپەی نازدار و فریشتەی جوانی
ڕۆڵە لای لایە ، شێرکۆ لای لایە
یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە
* * *
پەپوولەی سپی ناو باخی گوڵان
بنوو بەبێ ترس تا بەری بەیان
تۆم داوەتە دەس خودای نیگەهبان
ئێشک گری تۆن پەریی ئاسمان
هیوای دواڕۆژی بۆ قەومی کوردان
ڕۆڵە لای لایە ، شێرکۆ لای لایە
یاخوا شێرانە بێیتە ناو کایە
* * *
زەرەخەنەکەت پڕ نەشئە وەک مەی
گرو گاڵەکەت خۆشتر لە سەد نەی
ئاواتەخوازم کە زوو پێ بگەی
بەشەرتێ کە من ڕەنجەڕۆ نەکەی

رۆڵــە لای لایــە ، شێرکۆ لای لایـــە
یـاخـــوا شـــێرانە بێـنیتە نـــاو کایـــە
* * *
رۆڵــە وا مـن تــۆم هێـنایە بەرهـــەم
بە رەنـجی زۆر و بە شـیری مەمـــم
بە شەونوخـونی و ناخـوشی و ستــەم
ئەوەنـــدە لـە خــوا تەمــەنـنا ئەکـــەم
وەتــەن رزگارکەی لە ژێر باری غـــەم
رۆڵــە لای لایــە ، شێرکۆ لای لایـــە
یـاخـــوا شـــێرانە بێیــتە نـــاو کایـــە

## لای لایەی هەژار موکریانی (١٩٢١-١٩٩١)

لای لایەی شاعیر و فەرهەنگساز و وەرگێڕی گەورەی کوردمان، کـورد و کـوردستان پەروەر، مامۆسـتا (هـەژار موکـریانی)ی ئەمەر کە بـۆ کـوڕە بچووکەکەی هۆنیویەتەوە لای لایەیەکی نموونەییە، پڕ لە واتــای بــەرز و لە ئامۆژگـاری و کوردســـتان پــەروەری، لای لایــەکی نیـشتمانیی مەبەســتارە، هەسـتی کـوردایەتی و ســـوزی کوردســتان پەروەری و نـــازایەتی دەخـــاتە هــوش و ئەندیـــشەی منداڵانی کوردمان، ئەوشیان پێدەڵێت کـە رێــی خەبـات سەختـە و نـــازادی و رزگارکـــردنی کوردســـتانی نیـشتمانمان، یەکــێتی و خەبـات و قوربانیـدان و خۆڕاگـری دەوێت، ئاشبێت کورد لە کۆت و بەنــدنکردن و ئەشـــکەنجەدان سـڵ بکـاتەوە.. پێویـستە کـوردانە و مەردانە بژین.. بە کوردی بژین و بە کوردی بمـرین. کـەم بــژین و کەڵ بـژیـن.

هەندێ لە لایلایەبێژان بەزان یا نەزانن، هەندێک لە نێرەکانی ئەم لای لایەی مامۆستا هەژار موکریانی یان تێکەڵ بە لای لایەی فۆلکلۆری کوردیمان کردوون. ئەم لای لایەیە بە دەنگی هونەرمەندی گۆرانیبێژی ئەمرمان (محەممەد مامڵێ) بە ئاوازێکی شیرین و بە چریکەیەکی ڕەسەنی کوردی تۆماری کردووە.. ئەمەش دەقی هۆنراوەکەیە:

هۆنراوە: هەژار موکریانی
ئاواز و گۆرانی : محەممەد مامڵێ
دابەشکردنی موزیک: ڕەشید فەیزینێژاد

ڕۆڵە ڕووناکی گلێنەی چاوم
بەندی جەرگ و دڵ هێزی هەناوم
ڕێحانەی بۆن خۆش سوورە گوڵەکەم
ناو پڕشکێنی کوڵی دڵەکەم
چۆڵەمەی ئەستۆم ، ڕەگی حەیاتم
هەنگوین و قەندم ، نوقڵ و نەباتم
خەوی خێرت بێ بنوە درەنگە
تا کەڵەبابی بەیان بێ دەنگە
هەی لایە لایە ، ڕۆڵە لای لایە
ئەمشەو بەزمێت بە من دا نایە
ژێربەوە ڕۆڵەی ژیر و جوانم
لە داخی لانک دەگری نەزانم
دەڵێی بۆ حەپسم بۆ دەستە بەستم
بەو بەند و حەپسە من جەستە خەستەم
لە نێو کورد ئەبێ دەسڕازە نییە
ئەو بەند و قوفڵ و قەرازە چییە

کـــورِم مـــن لـه تـۆ بیـــرم زیـــاتره
دەســــرازەو لانـــــک بتبێ چـــاتره
هـەی لایـــە لایـــە ، رۆلـــە لای لایـــە
گوێگره پێت بلـێم لەبـەرچـی وایـــە:
راسـتە تـۆ نــــەوەی شـێری ژیـــانی
نەتــەوەی پـــاکی گـەلی کـــوردانی
بـەڵام چـونکە کـورد نـەورۆز بێ کەسـە
بەشـیان لـە دنیـا کــــوت و مەحبەسـە
بۆیـە دەتپێچـم تـا خـــووی پێ بـگری
نەک تـا مـن مـاوم لـە بەنـــدا بمـری
بـۆ چـاره ڕەشـیـت نەمـــاوه تێـــنم
هەر پێـم خـۆش نییە مـەرگت ببیـنم
هـەی لایـــە لایـــە ، رۆلـــە لای لایـــە
هـــــەزار تێیـــینی دوارۆژم لایـــە
بـۆت بەخـت دەکـەم عومری درێـژم
سەد تاڵی و سوێریت لەسەر دەچێـژم
نەمـامی بـــاڵات بـە فرمێسـکی چـاو
شـەو و نیوه شـەو لێی دەنـێم شـەوالو
ســەد چـاک و پیـرت بـۆ دەخولێـــمەوه
لـە بـن ســـێبەرت بحەســـــــێمەوه
هەر رەسیده بووی ، نەتـەوەی زالـــم
دەتبـرێ و بـــەزمیی نـایە بـەحـــالم
هـەی لای لایـــە ، رۆلــــەم لای لایـــە
دەک خلک بە سەر خۆم رەنجم بە بایـــە
پەشـێو پێی خـۆشـــە یەخسیر نەمێـنێ؟
سەربەستیت پێ بلێم بکەویە شـوێنی

قطــەم دەســت دەیــە ، بیـــە مەکتــەبی
وەخـت و بێ وەخت لە خوێنــدن نـــەبی
ئـەو کـــاتەی لەگـەڵ کـاکت دوو بـە دوو
بکـەن هـــاواری هــەقی لـە دەســچوو
دەس دەنـە دەس یـەک بـە را و تەگــبیر
یەکتان بە قەڵــەم ، یەکوو بە شـەمشێر
هـەی لایـــە لایـــە ، رۆڵـــە لای لایـــە
شـێریش جەوهــەری لە قەڵــەم دایـــە
یەک نامــە رەش کـا بـە داد و هـــاوار
یەک زەوی سوور کا لە خوێنی بەدکـار
یـەک لـە قورنیشـی بـــڕوا بۆ تــــکا
یـەکی قوڕ بە سـەر دوژمـــن دا بــــکا
ئـەو پەلەقـــاژەی نیســـتا لـە کن مـن
دەکەی بەند لادێ لە دەست و گـەردن
ئـەو تەقـــــەلایـەت بـۆ دوارۆژ باشــــە
جوچک هـەوڵێ دە ، بێ روحمی واشـە
هــەی لایـــە لایـــە ، رۆڵـــە لای لایـــە
دەس لـە دەس تەوفیق لە کن خـودایـــە
رۆڵـــە نیشـــتـمان چــاوی لـە رێـــتە
دایکمــــانە و هــــیوای دوارۆژی پێـــتە
بۆیــە نەندامت وەک میــنای بێ گــەرد
خاوێن رادەگـرم بە سـەد رەنــج و دەرد
چاکـەم دەیـەوە بۆ وەتــەن وەک کــوڕ
تۆش بیگەوزێنی لەنــاو خوێن و خــوڕ
پێت بڵێم رۆڵـــە سـەر سـوودی چییە؟
بـۆ بەردەبـــــازی رێـی نـــــازادی یــە

هەی لایە لایە ، رۆلە لای لایە
نیشتمان بۆ تۆ دەستە و دوعایە
رۆلە نامووست وەک خزمەکانت
نەفرۆشی بە پوول دەستم دامانت
شەرەف گەوهەرە قیمەتی نایە
دەویت رووڕەشی هەردوو دنیایە
ئەو کەسە پیاوە بۆ خەلک و ناوی
روحی دانێ و بە چەک بمێنێ ناوی
نەتبیستوە واتەی زانای سەرزەمین
مەردانە مردن نەک حیزانە ژین
هەی لایە لایە ، رۆلە لای لایە
بخوێنە نەزان چی لە دەس نایە

ئەم لای لایەیەی کە مامۆستا هەژار موکریانی داینـاوە، هونەرمەندی ئەمەرمـان (محەمـەد مامـلێ) لـە سەردەمی شـای رەگەزپەرستی ئێرانی گۆڕبەگۆڕدا، کە بە ئاواز و گۆرانییەوە وتی و بلاوی کردەوە، گرتیان و بۆ ماوەیەک لە زینداني دا لە شاری (ورمێ) دا، بۆ ماوەی چەند رۆژێک بەندیان کرد.

## لای لایەی قانیع (١٨٩٨ـ ١٩٦٥)

شاعیری چەوساوەکان و رەنجدەران، قانیع کە کوردستان پەروەرێکی دلسۆز بوو، هەمیشە دژی دووبەرەکی بووە، داوای یەکگرتن و یەکرێزی کوردی دەکرد، داکۆکی لە مافەکانی ژنانی

کورد دەکرد.. ئەم لای لایەیەی بە زمانی (نامینە) خانی خێزانییەوە نووسیوێتی، پڕە لە هەستی کوردایەتی و لە کوردستان پەروەری، لە ڕێنمایی پەروەردەیی، بەشێکی زۆری هونراوەکانی قانیع نیشتمانین.. ئەمەش لای لایەکەیەتی:

هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە
لە کزی کوردان دەنگم نایە
ڕۆڵەی خۆشەویست جگەرگۆشەکەم
مەرهەمی زامی بە پەرۆشەکەم
وەک تۆ پەروەردەی دامێنی منی
بێچووە شێرەکەی خاوێنی منی
منیش لە باوەش دایکی ترا بووم
بە شیری ڕاستی بەخێو کرابووم
من ڕاسپاردەی باب و باپیرم
فەرموودەی ئەوان هەروا لە بیرم
با بۆت بەیان کەم وەسیەتی ئەوان
بۆ چ غایەیەک منیان پێ گەیان
منیان پێ گەیان بۆ خزمەتی تۆ
بۆ بەخێوکردن، بۆ زەحمەتی تۆ
هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە
شاڵڵا لای لایەی گشت کەس وا بوایە
ڕۆڵە ئەم شیرە، شیری شێرانە
شیرەی نیعمەتی خاکی کوردانە
ڕۆڵە بێشکەکەت داری قەمزوانە
ئەمامی مەندەی بلخی بابانە

بەغی دەسرازمت خوریی شەکی کال
دابەستەی کوێستان ، چراگای سەر یال
ناوی خواندموت ، کالی "جەیران"ە
چێشتت برنجی دەشتی " مالوان"ە
هەی لایە لایە ، رۆلە لای لایە
خۆزگە تۆوی نیفاق هەرگیز نەبوایە
شیرە راستەکەم نەخۆی بە درۆ!
سەرسەری نەبی نەمەکەی رەنجەرۆ!
هەرگیز نامووست بە پارە نەدەی!
ناوەل کوردی خۆت ناوارە نەکەی!
رۆلە بۆیە تۆ بەخێو نەکەم
رەنجی داماویت لەگەڵا نەدەم
تۆش خزمەتکاربی بۆ گەل و هۆزت
قەت قوسوور نەکەی بۆ بەرزی کۆزت
هەی لایە لایە ، رۆلە لای لایە
میللەتی بێ خێو ، روو لە بەڵایە
رۆلە خلیەن بی بە ناو و خاکت
دەک نەجەل بگری دامێن و چاکت
تۆ بەخێو ناکەم بۆ خەو و خواردن
یا وەک هەندێ کەس بۆ چاوشۆڕکردن
کوڕم! نەتبیستوە، مەشوورتر لە گشت؟
"سەر بۆ سەربڕین نەک بۆ سەرزەنشت"
رۆلە هەر کاتێ خوێنت بڕژێ
بە گوللەی دوژمن مێشکت بپژێ
رەنجەم حەڵاڵت شیرم نۆشت بێ
کزی کوردستان فەرامۆشت بێ

هەی لایــە لایــە ، رۆڵـــە لای لایــە
کۆمــەڵی نــــەزان ، وەک کـا و بـایــە

## لای لایەی مەلا ئاوارەی سەردەشتی (١٣١٣ ـ ١٣٤٧) کۆچی

شەهیدی ئەمـری گەلەکـەمان (ئەحمەد محەمەد ئەمین هەمەوەنـدی) بە (مــەلا ئـــاوارەی سەردەشــتی) ناوبانــگی دەرکـــردووە، لە دێـــی (شەلـەماش)ی سـەر بە سەردەشـــت لە دایـک بــووە. مــەلا ئـــاوارە کــورد و کوردسـتان پـەروەرێـکی سەرسەخـت بـوو، تێکـۆشەرێکی قارەمـان و چـاونەتـرس بـوو، لـە دژی رژێـمی شـای گـۆڕبـەگۆڕی ئێرانی داگیرکەری رۆژهـەڵاتی کوردستان، چـەکی کوردایـەتی و مەردایـــەتیی هەڵگــرت و داوای لە خەڵکــی کوردســـتان کــرد، کە راپـەڕن و چـەک هەڵبگرن و چـیتر سـتەم و نـاڕەوایی و سـەرکوتی قبوول نەکەن. لە سـاڵی (١٣٨٩) ی کۆچــی دا، بە دەستی پیـاوکوژە بێڕەوشتەکـانی شـــای ئــێران گوللــەبــاران کــرا، لە سەردەشـــت بە خاـک سپێرا.. مەلا ئـاوارە خـاوەنی دیوانێکی هۆنـــراوەی بـابەت ئیشتمانی و سیاسـی و کۆمەڵایەتییە، هۆنـراوەکانیشی لەسـەر کـێشی خۆمــاڵی کـــوردین. وەکـــوو نموونـــە لە هۆنـــراوە ئیشمانییەکـانی، پێــمان خـــۆشە کــە ئـــەم ســێ دێـڕە هـــۆنراوەی بخەینە بەر دیـدی خوێنەران، تـا بـزانن کە مەلا ئـاوارەی سەردەشتی چەنـد کـــورد و کوردستان پـەروەر بـووە:

لێم ببـڕن خـۆراک و خـەوی
کـوردم و کوردســـتانـم دەوێ
هیـوای بـەرزم قـەت نـاتـەوێ
تـا قـۆنـــاخی سـەربـەســـتی

نەسپی خەبـــاتم نـاوەســـتێ
تـا دەرنەچـم لە ژێردەســـتی

ئەم لای لایەیـە یەکێکە لە شاکارە هۆنراوەکانی مەلا ناوارە. هەندێ لە دێڕەکانی ئەم
لای لایەیە تێکەڵ بە فۆلکلۆری کوردی بوونە.. دەشێ مەلا ناوارە سوودی لە لای لایەی فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووبێت .. ئەمەش دەقی لای لایەکەیەتی:

رۆڵـــە کورپــەکەم نــارامی گیــانم
خونچەی گوڵــزاری باغچەی ژیـــانم
جگەرگۆشــەکەم بەرهــەمی ژیـــنم
سەروەت و مــاڵم ، نـایین و دیـــنم
هــێز و تــەوژمم ، بیـناى چـــاوانم
هـاودەنگی بــەزمی رۆژ و شـــەوانم
رۆڵـە گـیان مەگری مەگرە بەهــانە
بنـــوو درەنــــگە بــــەری بەیــانە
هەی لایە لایە کورپـــەی ســـاوایە
کوێربێ ئەو چاوەی بە تۆ هەڵــنایە
* * *
هەرچەن تۆ دەگری جەرگـم کەبــابە
من بۆ تۆ چۆنم تۆش بۆ من وابـــە
تۆ شـــاگوڵی جـوان من پاســـەوانم
نـــازت دەکێشــم هەتــا دەتــــوانم
دایــک ئەو کــاتە دڵــی دەســــرەوێ
کە کورپەی ساوای بێ خەم وەرکەوێ

یان بە بزەی لێو بە خەندەی زاری
ناڵوگۆڕیان کا گریان و زاری
هەی لایە لایە کۆرپەی ساوایە
قەزات لە گیانم تاقانەی دایە
* * *
هەتا ئێستا کە منداڵی وردی
خەڵف و نەمامی بێستانی کوردی
شلکی ناسکی نەت داوە بای بەڵ
دەرت نەکردووە برو و خەت و خەڵ
بێ زمان بێ بیر بێهۆش و تاقەت
خەمبارم دەکەی بە گریە و زاقەت
بەڵام بە هیوای دوارۆژم سادەی
نەکەی ڕۆڵە ڕەنجم بە بادەی
هەی لایە لایە کۆرپەی ساوایە
دایەت ماندووە بۆچ خەوت نایە
* * *
هیوام زۆر پێتە وەک باب و کاکت
ببیە پێشمەرگەی نەتەوە و خاکت
بمخێوت نەکەم بە گیان و بە دڵ
نەکەی بترسی و لە هیچ بکەی سڵ
زانا و خوێندەوار چاو و دڵ تێربی
ڕۆژی تەنگانە پڵنگ و شێربی
لاوێکی گورج و خاوەن هۆش و بیر
نەترسی لە بەند لە کۆت و زنجیر
هەی لایە لایە ڕۆڵە لای لایە
کۆرپەکەم دوارۆژ لاوی نازایە

## لای لایەی مینە جاف (١٩١١ ـ ١٩٦٥)

شاعیری ناوداری کوردمان، حەمەئەمین کەریم بەگی فەتاح بەگی حەمە پاشای جاف، کە بە نازناوی ئەدەبی (مینە جاف) ناسراوە، لە ساڵی (١٩١١) لە قەڵای شیروانە لە کەلار لە دایکبووە، خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت خوێندووە. مینە جاف شاعیرێکی زیرەک و بلیمەت بوو. کوردستان پەروەرێکی سەرسەخت بوو، دلێر و بوێر بوو. ئەمە راستییانەش لە هۆنراوە نیشتمانییەکانیدا رەنگیان داوەتەوە.. بێجگە لە هۆنراوەی نیشتمانی، مینە جاف کۆمەڵێکی زۆریش هۆنراوەی خۆشەویستی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و هەرزەنگەی هەیە. چەند لای لایەیەکیشی بۆ منداڵان داناوە.

مینە جاف عەرەبی و فارسی و تورکیشی دەزانی.. مینە جاف لە ساڵی (١٩٦٥) لە بەغدا کۆچی دوایی کرد. لە گۆڕستانی (سەید خەلیل) لە نزیک کەلار بە خاکیان سپاردووە.

مینە جاف لە ساڵی (١٩٤٧) دا، ئەم لایە لایەیەی بە ناوی هاوسەرەکەیەوە (مەلیحە) خان، بۆ (سەرتیپ)ی کوڕی نووسیوە، کە پڕە لە هەست و سۆزی نیشتمانی:

هەی لایە لایە سەرتیپ لایە لایە
خوا فرسەت بدات بگەین بە غایە

هەی لایە لایە رۆڵەی شیرینم
تازە ئەمامی گوڵزاری ژینم

هەی لایە لایە سەرتیپ بینایيم
تاج و تەختی گەنج، کەوکەبەی شایيم

غونچەی نەورەسەم مایەی حەیاتم
نووری بینایی، رووی سەر بستانم

سەرتیپ تۆ ئەمشەو بۆچی ناخەوی
چیت لێقەوماوە تۆ خوا ناسرەوی

من بە لای لایەیێ نەتلاوێنمەوە
بۆ بەردی بکەم نەیتاوێنمەوە

رۆڵە بۆ نانوێت، بۆ خەوت نایە
بۆ بێ دەنگ نابێت بە لایە لایە

نێزی دەردێکی تازە لە دڵتە
بۆیە بەم شەوە تەپاو تلتە

نیشی تێکچوونی خاکی کوردستان
ئەڵبەت لێی داوی ئەمشەو تا بەیان

برایەوە خەوت ئارامت قاتە
دەنگی گریانت لە سەماواتە

هەی لایە لایە بینایی دیدەم
سەرتیپ عەزیزم ئەی بەرگوزیدەم

گوێ بگرە لە من کورپەی ئەخشینم
مایە و سەرمایەی دوکانی ژینم

کورم تۆ بێژیت تا ئاخر زەمان
هەر حەپس و بێمش بوون کورد زوان

پـەتی سـێداره و بـەنی قەنـاره
بووبێـتە نـیرسی کوردی بێچـاره

تۆپ و تەیاره و زرێلی شەست تـیر
بۆمـبا و دەبـابە و بـڕنـاو و شـمشیر

بۆ قەتـڵ و عـامی ئێـمە کـڕیا بێ
هەر کـورد بێ فتـوای قەتـلی دریا بێ

کوڕم قەومەکەت کـوت و زنجـیری
نەفی و قەتل و عەلەم حەپس و نەسیـری

وەی وێـنە کـڵ وا بـڕیـاوە بـاڵای
دووریـاگە بەری سەر تا پەنجەی پـای

گەر باوەڕ ناکەی تۆ سەیری خۆت کە
سەیری دەسرازە و بـەنی بێشکەت کە

ئەوسا ئەیـزانی زنـجـیر و حـەپـسی
کورد بە شـیرخوری بووە بە نـیرسـی

هەی لایـە لایە رۆڵـەی زاڵم سـەختـم
غەمگین و غەمبار قـەومی بەدبـەختـم

هـیـوات قەوی بێ کـوڕم بە یـەزدان
ئەسـی نایـەتە لە پـەرەی قورئـان

لە پاش گشت شتێ خۆشی روو ئـەدا
فـاین مـع ل خـۆی فەرمـووی خـودا

ئێستە بە لایـە لایـە بێدارت ئـەکـەم
لە چاکی و قەومت هۆشیارت ئـەکـەم

کە پێگەیشتی ئەتـنـێمە خـــــوێندن
ئـەتنـێمە مەکتەب بـۆ تەحسیل کـردن

ئەتنێمە مەکتەب قـەومی ئـەجـنـەبی
ئەوەک بۆ کورسی و بۆ سەر مەنسەبی

ئەکوو بخـوێنی تـۆیش وەک پێشوەکـان
بۆ کورسی و زیو و بۆ روتبە و نیشان

بـە نـاوی کوردە ۆ بگـەیتە کـورسی
قەومت زەبوونەکەی لە قەید و حەپسی

بخـوێنـە کـورم ئەمـە غـایـــەت بـێ
بەرزیی کوردستان بـەرزیی پایـەت بـێ

هـەی لایـە لایـە سـەرتیپ لای لایـە
خـوا شـادمـانـت کا بگـەیتە کـایـە

<u>لای لایەی (حەبیبە خـان: ١٩٢٤ـ ١٩٧٧) کچی کەریم بەگی جاف</u>

ئەم لای لایــە، لە دانـانی (حەبیبە خـان)ە، کە بـۆ (حەسـەن)ی بـرا بچووکی (دکتور حەسەن جاف) نووسیویەتی، لە سالی (١٩٤٣) دا لە گۆڤـاری (گەلاوێژ) دا، بە ناوی (لایـە لای) بـە نـاوی خـوازراوی (لـە کـەلارەوە ـ ژنـە جافـێک) بـلاوکـراوەتـەوە. بـە خوێندنـەوەی لایە لایەکەی بۆ تـان دەردەکەوێت، کە حەبیـبە خـان، ژنـە کـوردێکی رۆشنبیر و دلسۆز و کورد و کوردستان پەروەر بووە. شاعیر بووە و شـــــارەزایی لە دانـــــانی هــــــۆنراوەدا هەبــــــووە. بەلام پێویـستە نامــاژەش بەوە بــدەین، کە دەقــی ئەم هــۆنراوەیە لە

ریزبەندیی هۆنراوەکانی مینە جاف لە دیوانەکەیدا هەیە، بۆیە دووریش نییە کە مینە جاف بە ناوی حەبیبە خانی خوشکییەوە بۆ حەسەنی برای هۆنیبێتەوە بەڵام تا ئێستا هەر بە ناوی حەبیبە خانەوەیە. حەبیبە خان، ژنێکی سوور و سپی و جوان و و شۆخ و شەنگ و خان و مان بوو، کەسایەتییەکی ناسراو بوو. ناوی کەوتووەتە سەر زاری چەندین گۆرانیبێژی کوردمان و بە سەریدا هەڵیان داون. لەوانەش: شکور خەیات و حوسێن عەلی و سەلاح داودە.

حەبیبە خان .. وەی حەبیبە خان
گوڵ مەجلیسی .. دیوەخان
حەبیبە خان .. وەی حەبیبە خان
گوڵ مەجلیسی .. ناو دیوەخان

دەقی لای لایەکەی (حەبیبە خان)ە بۆ حەسەنی برای کە ئەمڕۆ (دکتۆر حەسەن جاف)ە:

هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
لە خوام گەرەکە بگەیتە پایە
پایە بڵند بی بەرزی مەقامت
بەو شەرت سەربەستی کورد بێ مەرامت
هیوا و خەیاڵت حوریی کوردان بێ
روحت فیدای رێی نیشتمان بێ
چاوت لە بەرزی و ژینی وڵات بێ
فیدای وەتەن لە لات خەڵات بێ
کورپەکەم گوێ بگرە لە دەنگی دایە
بە دڵی خوێنینەوە بۆت ئەکەم لایە

پەردەی دڵەکەم پڕ لە خوێناوە
بۆ زەلیلی کورد جەرگم براوە
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
کەی لە نەزانین رزگار بوینایە
رۆڵەم نازانم بۆ خەوت نایە
ئێشی بێ کەسی کورد لە دڵتایە
بۆیە من شیری سپیت پێ نەدەم
بە خوێنی جگەر پەروەردەت نەکەم
سەر و ماڵ و گیان گشتی فیداکەی
قەومەکەت لە ژێر جەهل رەهاکەی
کوڕم پێت ئەڵێم تۆ کورد زەمانی
ئەمامی نەورەس باخی کوردانی
دەخیلت بوگم کۆرپەی نەخشینم
تازە گوڵ غونچەی گوڵزاری ژینم
کە پێ گەیشتی ئەمە تەدبیربێ
ئەم کزەی کوردت دایم لە بیربێ
هیچ درێغ نەکەی بە روح و بە گیان
تا وەرئەگری تۆڵەی کوردستان
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
نازانم بۆچی تۆ خەوت نایە
ئەلبەت تۆش وەک من دڵ پڕ برینی
بۆ کوردی بەدبەخت جگەر خوێنینی
ئێشی کوردستان تۆی لە تۆی دڵتە
بۆیە بەم شەوە تەپیاوە تلتە
حەسەن من هیوام وایە بە یەزدان
زوو بێنیتە بەرهەم بە عیلم و عیرفان

ببی بە نەسباب بۆ یەکێتی کورد
گەردنی نیفاق بشکێنی ورد ورد
ڕۆڵە بۆ پارە چاو لە خوار نەبی
قەت دوژمنی کورد بۆ نەغیار نەبی
هەی لایە لایە حەسەن لای لایە
لەم گێژی غەمە کەی دەرچووینایە

ئەمەش لای لایەکی ترە لە هۆنراوەی خاتمە شاعیری کوردمان (حەبیبە خان) ی کەریم بەگی جاف، کە بۆ (سەرکەوت) ی کوڕی وتوویەتی.. ئەم هۆنراوەیەش لە دیوانەکەی مینە جاف دا هەیە.. ئەوەش یەکلایی نەبۆتەوە، ئایە هۆنراوەی مینە جافە کە بۆ خوشکەزاکەی بە ناوی (حەبیبە خان)ی خوشکییەوە نووسیویەتی یا هۆنراوەی حەبیبە خان خۆیەتی؟ دەقی لای لایەکەی بۆ سەرکەوت:

هەی لایە لایە سەرکەوت لای لایە
ڕۆڵە گوێ بگرە لە دەنگی دایە
* * *
ئەو دایەی دوو جار گیان و تەم و خەم
چاو پڕ لە فرمێسک ، دڵ خوێناو و تەم
* * *
ئەپرسی ڕۆڵە بۆچی پێشووەکان
هیچ هەوڵیان نەدا بۆ ڕێگەی کوردان
* * *
کام ڕێ ڕێی بەرزی قەومی دواکەوتوو

کام ڕێ ئەو ڕێگەی ناویشی گوم بوو

* * *

گوێ بگرە سەرکەوت ڕۆڵەی شیرینم
لە خەوام گەورەکە مەرگت نەبینم

* * *

ئەم جەژنی نەورۆز من چووم بۆ ئێران
تووشم بوو پیرێ لە شوێنی سەیران

* * *

پرسیم لەو پیرە ئەم خاک و ناوە
ئێستا داکەوتوو و مەلت و داماوە

* * *

هەلتە زوان پیری کۆنە سال
جوابی دامەوە بە زوانی حال

* * *

وتی ئەم خاکە ماوای کوردان بوو
نۆشینگەی تەختی ڕۆڵەی مەردان بوو

* * *

جێگای حاکمی پاشای کورد بوو
ماوای شێرانی ڕۆژی نەبەرد بوو

* * *

گەردشی گەردوون چەرخی بەد ستەم
تێشکی دا دەزگای شاهانی حەشەم

* * *

دوژمنی شاد کرد بە خاک و ناومان
ناوی گوم کردین زەلیل بوو ناومان

* * *

نەمــــاوە خـــــەوم نـــــــارام قـــــــاتە
تەمـــــی هــەناســــــەم لــە سەمـــــــاواتە
* * *
هـەی لایـــە لایـــە سەرکەوت لای لایـــە
رۆلــــە گــوی بــــگرە لــە دەنـــــگی دایـــە

## لای لایەی (هێنریک نۆردبرانت ـ دانیمارکی) بۆ نایلان کوردی
## وەرگێرانی لە دانیمارکییەوە بۆ کوردی (نـالان پەری)

نالان کوردی (هەروەکوو راپۆرت و هەواڵەکان بە نایـلان کـوردی ناویان برد) منداڵێکی جوانی شاری (کۆبـانی) ی قارەمــان بوو، لە رۆژئـاوای کوردستان. نـالان تەمەنی سێ ساڵان بوو لەگەڵ بـاوکی و دایکی و براکەی بە بەلەمێک بە دەریای سپیی نـاوەراستـدا، بەرەو ئەوروپـا کەوتنە رێ. لە نـاوەراستی دەریـاکەدا، شەپۆلەکانی دەریـا بەلەمەکەیـانی نوقـم کـرد، هەموویـان ژێـر نـاو کەوتن. نـالانی (٣) ساڵان و (رێحانە)ی دایکی (٢٨) ساڵ و (غـالیب)ی برای (٥ ساڵ) خنکان و گیانیان لەدەست دا، تەنیا عەبدوڵلا کوردی بـاوکی رزگـار کرا.. لـە رۆژی (٢ی/ سێپتەمبەر/٢٠١٥) تەرمـی نـالان کوردی لە رۆخی دەریای نـیجە، لـە قـەزای (بـۆدروم) سـەر بـە پـارێزگـای (مـوغلان) لـە تورکیا دۆزرایەوە.

چیرۆکی تراژیدیای نالان کوردی، پەیامێکی جەرگبڕ و دڵ تـەزێن بـوو. بوو بە مانشێتی میدیاکان و لۆکاڵییەکان، ویـژدانی جیهـانی و مرۆڤـایەتی بە ناگاهـێنایەوە. کـاردانەوەیەکی نێودەوڵەتیی لـێکەوتەوە. نــــالان بـــوو بە سـیمبولی کارەســـاتی بە هـــەزاران لە کـــۆچبەران. باوکی نالان نەیویست خێزانەکەی گۆڕغەریب بن، لە رێوڕەسمێکی

ملەمینی شلیستەدا، لە شاری کۆبانیی قارەمان، زێدی شیرینیان، بە خاکی پیرۆزی کوردستانی سپاردن.

بۆ ڕێزلێنان و بەرزڕاگرتنی ناوی نالان کوردی (ڕێکخراوی هاوکاری چاوی دەریا) کە بارەگای لە شاری (ڕیگینسبوگە) لە ئەڵمانیا، ناوی نەو کەشتییەکەی کە لە دەریای سپیی ناوەڕاستدا کاردەکات، لە ناوی کەشتی ( پرۆفیسۆر ئالبریخت ئینک) ەوە، گۆڕی و ناوی لێنا (کەشتیی فریاگوزاری ئیلان کوردی) بۆ ڕزگارکردنی کۆچبەرانەی کە مل بە دەریای سپییەوە دەنێن. لە ڕێوڕەسمێکدا، کە لە ڕۆژی (١٠ی/ ئاوگوست/٢٠١٩) لە دوورگەی پالیمای مالۆرکای ئیسپانی، بە ئامادە بوونی (عەبدوڵلا کوردی) و (بیما کوردی)ی خوشکی (پووری نالان) ناوە تازەکەی کەشتییە ئەڵمانیاکە بە ناوی (کەشتیی فریاگوزاری ئایلان کوردی) یەوە ڕاگەیەندرا.

حکومەتی فنلەنداش، بۆ سەرنج ڕاکێشانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە لای مافی مرۆڤ و دادپەروەریدا، وێنەی نالان کوردی لە باوەشی نەو پۆلیسەی کە تەرمەکەی لە ڕۆخی ئیجەدا دۆزییەوە و لە باوەشی کرد، خستە سەر دراوی ئیشتمانیی فنلەند دا.

هونەرمەندی دەرهێنەریش کاک (جوبرانیل نەبوبەکەر ڕەحمان) کە خەڵکی هەولێرە، بە سپۆنسەری (زانکۆی نۆلیج) فیلمێکی سینەمایی بە ناوی (ئایلان) ەوە دەرهێنا، کە لە فێستیڤاڵەکانی فیلمی نێونەتەوەیی بەغدا و کەربەلا و ئێران و ئەمریکا و ئیتالیادا نمایش کرا، لە ئێران خەڵاتی باشترین فیلمیان پێبەخشی.

هونەرمەندی پەیکەرسازیش کاک (بەختیار هەڵەبجەیی) پەیکەرێکی بۆ نالان کوردی دروست کرد. لە ڕۆژی (٢٠١٦/٢/٢١) دا، لە

پـاركی نــازادی لە شـاری سـلێمانی، لەسـەر ڕوخـی دەریـاچەیەكی بچووكی ناو پاركەكەدا، پەردە لەسەر نـەم پەیكەرەی نـالان لابـرا.

لـە (كەنـەدا) ش، پەرتووكـێك دەربارەی ژیـاننامەی نـالان كـوردی لـە نووسینی خاتوو (بیما كوردی) كـە پـووری نـالانـە، چـاپكـرا و بـڵاوكـرایـەوە.

داواش لە بەڕێوەبەرێتی خوێنـدنی كـوردی لە كەركـووك دەكەم، كە باخچەیەكی ساوایان لـە شـاری كەركـووك دا، بە نـاوی (باخچـەی نـالان كـوردی) یـەوە بنێن.

ئەمەش دەقـی تێكـستی نـەو لای لایەیـە، لـە هۆنـراوەی شاعـیری نـاوداری دانیمـاركی (هێنریـك نۆردبرانت) كە بۆ مەرگـی ساوای جـوانەمەرگمان (نـالان كـوردی) نووسیوێتی.

<u>لای لایەی سەربێشكە</u>

<u>هۆنـراوەی: هـێنریك نـۆردبـرانت</u>

<u>وەگێڕانی بۆ كوردی: نـالان پەری</u>

منـداڵە بچـكـۆلانەكەی جـەنگ لە كـام لاوە دەڕۆیـت ؟
بەرەو ڕۆژهـەڵات یا ڕۆژنـاوا ؟
بە ڕای تـۆ لە چ شوێنـێكی ئەم دونیـایە
هـاوڕێیەك دەدۆزیتـەوە ؟

منـداڵە بچـكـۆلانەكەی جـەنگ
كامیـان بۆ تـۆ باشـترە ؟

پێخـەفێکی دڕاو ؟
کفنـێک لە تەختەی تابـووت ؟
یا پۆشـاکێکی رزگـارکەر ؟

مـنداڵە بچـکۆلانەکەی جـەنگ
لە کـوێ حەزدەکەیت بمـرێـت ؟
لە ژێـر مووشـەک
یا لە سەر دەریاچەیەکی کراوە ؟

مـنداڵە بچـکۆلانەکەی جـەنگ
بۆ کـوێ دەڕۆیـت ؟
خـۆت هـەڵبژێـرە
بەڵام وا بکە جارێـکی تـر نەتبیـنینەوە

<u>لای لایەی هونەرمەند مەزهەر خالقی</u>

هـونەرمەنـدی گـەورەی گەلەکەمان، نەفـسانـەی گۆرانی و میلـۆدیی رەسەنی کوردیمان، مامۆستا مەزهەری خـالقی لە ساڵی (١٩٣٨) لە شارە جوانەکەی رۆژهەڵاتی کوردستان، (سنە)ی پـایتەختی هـونەر و ئەدەب و کولتـووری رەسـەنی کـوردی لەدایکبـووە تـا قۆنـاغی خوێندنی ئامادەیی لە سنە تەواوکردووە. بڕوانامەی (بەکالۆریۆسـی لە فیزیا) و ماستەری لە (بەڕێوەبردنی پیشەسازی) لە زانکـۆی تـاران وەرگـرتـووە. بــۆ ماوەیــەک لــە بــواری پەروەردە و خوێنـدنـدا مامۆستا بووە.. وەکوو بێژەر و گـۆرانیبێژیش لە چەند رادیۆیەکـدا کاری کردووە، لە بەشی رادیۆی (سـنە، کرماشـان، تـاران). رۆڵـی هەبووە لەم رادیۆیانە.

مەزهەری خالقی هەر لە منداڵییەوە هۆگری گۆرانی و موزیک بووە. لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە، چۆتە ناو جیهانی بەرینی گۆرانیی کوردییەوە و تا ئەمڕۆژ دانەبڕاوە.. بە دەنگە زوڵاڵ و نەفەسوناوبییەکەی، بەدەیان گۆرانیی کوریی وتووە و تۆماری کردوون. دەیان هونەرمەندیش گۆرانییەکانیان وتوونەتەوە. خالقی خاوەنی ڕێبازێکی هونەری و قوتابخانەیەکی گۆرانیی و ناوازی ڕەسەنی کوردیمانە.

مەزهەر خالقی لە ساڵی (١٩٨٣) هاتۆتە باشووری کوردستان و هەر لەو ساڵەدا، چۆتە لەندەن و بووە بە پەناهەندەیەی کورد لە بەریتانیا.. لە دوای پرۆسەی ئازادی عێراق گەڕایەوە باشووری کوردستان و درێژەی بە خزمەتە پیرۆزەکەی داوە.. جێ پەنجەی لە گەشەکردن و پێشکەوتنی بزووتنەوەی کولتووری کوردی دیارە. مامۆستا خالقی، دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری دەزگای (ئینستیتۆی کولتووری کورد)ە، کە بە شاکارێکی گەورە دەزانرێت بۆ کۆکردنەوە و تۆمارکردن و دیکۆمێنت کردن و پاراستنی کولتووری کوردیمان.. لەم بوارەدا خزمەتێکی گەورەی هونەر و کولتووری کردووە و پێگەیەکی بەرزی هەیە.. جێی ڕێز و پێزانین و شانازییە لای گەلەکەمان.

لقی سەرەکیی ئینستیتۆی کەلەپووری کورد، لە شاری سلێمانییە، لقێکی لە دهۆکیش هەیە، ئۆفیسی لە شاری کەرکووک و لە چەند شارێکی کەی کوردستان دا هەیە. وەکوو ڕێزلێنان و پێزانین بۆ ئەوە خزمەتە زۆرەی کە مامۆستا مەزهەری خالقی پێشکەشی هونەر و کولتووری کوردی کردووە.. چەندین خەڵاتیان پێ بەخشیوە، زانکۆی سلێمانی ئەمساڵ (٢٠١٩) (بڕوانامەی دکتۆرای ڕێزلێنان ـ شانازی

ـ فەخری) بە مامۆستا مەزهەر خالقی دا، لە پاداشتی ئەو هەموو خزمەتەی کە کردوویەتی. هەر ئەمساڵ (خەڵاتی ساڵانەی ئێیراهیم ئەحمەد ـ لە بواری هونەر) درایە مەزهەری خالقی.
مامۆستا مەزهەر خالقی، شکۆی گۆرانی و ئاواز و موزیکی رەسەنی کوردی، شایەنی ڕێزلێنانێکی زیاتر و خەڵاتی گەورەترە.. بەڵام خۆشەویستیی گەلەکەی بۆی گەورەترین خەڵات و ڕێزلێنانە بۆی.

هیوای تەمەنی پڕ لە تەندروستی و تەمەندرێژی و شادی و کامەرانیی بۆ دەخوازین.

هۆنراوە: فۆلکلۆری کوردی
ئاواز: فۆلکلۆری کوردی
ڕێککردنەوە و ڕێکخستنی: موجتەبا میرزادە

ڕۆڵەی خۆشەویست بینایی چاوم
هێزی ئەژنۆم و هیوای ژیانم
هەتا دنیێتەوە هەر چاوەڕێتم
هەڵۆرکی منالێت هەر ڕادەژێنم
* * *
لای لای ئەمەمی ژیانم
مەن وێنەی باخەوانم
بە دڵ چاوەدێریت دەکەم
بخەوە دەرێت لە گیانم
* * *
هەی لای لایە لایە لایە
کورپەی شیرینم لایە

بنووە تاکو سبەینێ
مژدەی ناواتم دێنێ

* * *

ئەی بەرخۆلەی شیرینم
ناواتی هەموو ژینم
شەوی تاریک نامێنێ
تیشکی ڕۆژ دێتە سەرێ

* * *

هەی لایە لایە لایە
کۆرپەی شیرینم لایە
بنووە ئاسۆ ڕووناکە
دیارە وەک ڕۆژ ڕووناکە

* * *

لای لای نەمامی ژیانم
من وێنەی باخەوانم
بە دڵ چاودێریت دەکەم
بخەوە دەمرت لە گیانم

* * *

هەی لایە لایە لایە
کۆرپەی شیرینم لایە
خۆزگە سەد خۆزگە بە خوایە
دایکی تۆ لێرە بوایە

* * *

لای لای نەمامی ژیانم
من وێنەی باخەوانم
بە دڵ چاودێریت دەکەم

بخـــــــــــموه دەرنت لـه گـــــــــيلتم

* * *

هـــەی لایـــــــه لایـــــــه لایـــــــه
کـوڕپـــــەی زۆر جـــــوانم لایـــــــه
ســـەد خۆزگــــــه بـو خـۆزگـــــــایه
دایـــــــکی تۆ لــــــــێره بـوایـــــــه

* * *

لای، لای، لای، رۆڵـــه لای، رۆڵـــه لای
کەسم لای، گیلتم لای، گوڵم لای، لای لای

هونەرمەندی دەنگخۆشی فارسی خاتوو (کەتایون) کە هۆگری گـۆرانیی کـوردییه و کە تـا ئێستا چەنـد گۆرانییـەکی کـوردیی تۆمـارکـردوه، یەکـێک لـەو گـۆرانیـیانەی ئـەم (لای لایـە)یـەی مامۆستا مەزهەری خـالقی یـە.

مامۆسـتا مەزهـەر خـالقی بە نـاوی (لای لایـەی نیشـتمان) کە بە شێوەی مەقام و بەستە دەیڵێت و تۆماری کردووە.. بریتییە لە سـۆز و خۆشـەویستی بۆ کوردستانی نیشتمانی پیـرۆزمـان.. تێکستەکەشی تێکهەڵکێشە لـە هۆنـراوەی قـانیع و عـابد سراجـەدینی:

هۆنراوە : مامۆستا قـانیع و عابـد سراجـەدینی
گۆرانی : مـەزهـەر خـالـقی

میلۆدی : حەسەن یوسف زەمـانی
تەرینج و رابەر : مورتەزا حەنـانە
ئـۆرکستڕای گـەورەی تـاران
سـالی تۆمـارکـردنی : ١٩٦٣

ئـــەی لایـــــە لایـــــە ، رۆڵـــــە لای لایـــــە
خۆزگـــە لای لایـــەی ، گشت کەس وا بوایـــــە
رۆڵـــەی خۆشـــــەویست ، جگەرگۆشـــــەکەم
مەرهـــــەمی دڵـــــەی ، بە پەرۆشـــــەکەم
تۆ نـــاو و نـامـــان بی ، بۆ گــــەل و هـــۆزت
قـەت قـســوور نەکــەی ، بۆ بـــەرزی کــۆزت
* * *
لای لایە ئەمـــامی ژیـانم ، مـن وێنەی باخـــەوانم
بە دڵ چـاودێریت دەکەم ، بە فرمێسکی چــاوانم
تا لـە خـــەزانی ژینـــم ، ئـەرزی گـەڵای ئـــەوینم
لـە سێبەری بـــاڵاکەت ، شـادبێ دڵـی غـەمگینم
* * *
هەوڵدە بێ سێبەر نەبی ، وەک داری بێ بێ بەر نەبی
بۆ هـاوماڵ و هـاوخوێنت ، بێ پلیـە و سەمەر نەبی
لای لایەت بۆ ناکەم ، تاکو بە نـــاز خـەو بتباتەوە
یاخود پـەژارە و خـەفەت ، ژینت لەبـــیربباتەوە
ئەمە لای لایەی ژیانە ، دەنگی دایکی نیشـتمانە
لە تاریکە شەوی ژیـن ، ئەستێرەی رەنگـــمانە
پێت ئەڵێم کە وریابی ، خوێنـــدەوار و زانـــابی
لە بۆ گـــەل و وڵاتت ، تێگەیشـــتوو و ناگـــابی

# لای لایەی
# گۆرانیبێژی نەمری گەلەکەمان

حەسەن زیرەک (١٩٢١ـ ١٩٧٢)

هونەرمەنـدی گۆرانیـبێژ و موزیکـزانی سروشـتی گەلەکەمـان، ئیمبراتـۆر و ئەفسانەی گـۆرانیی کوریمـان (بولبـولی کوردسـتان) حـەسـەن عـەبـدوڵلا کە بە (حەسـەن زیـرەک) ناوبانگی دەرکـردووە. لە سالی (١٩٢١) لە گونـدی (هەرمێلە) سەر بە شـاری (بـۆکـان) لە رۆژهەڵاتی کوردستان لەدایکبووە. بە بـێ بـاوکی و بە کـوێـرەوەری و مەینـەتی و بە دەربەدەری و بـێ دەرەقـانی و بـێ لانەیـی ژیـا و سەری نـایەوە. لە سـالی (١٩٧٢) هەر لە بـۆکـان کـۆچی دوایـی کـرد. لەسـەر (کـێوی ناڵەشـکێنە) بە خـاک سپـێراوە. لە ئەمـڕۆدا گـۆرەکەی بـووە بـە مەزارگـەی هونەرمەنـدان و هـەوادارانی دەنگی حەسـەن زیـرەک.

حەسـەن زیـرەک زیاتـر لـە (١٥٠٠) گـۆرانیی وتـووە، بەشـی زۆریانی لـە رادیـۆکـانی کرماشـان و تـاران و بەغـدا و تەوریـز تۆمارکــــــردوون. هـەندێکیـــــشیان تۆمـــــار نەکــــــراون. بە فارسی و ئازەریش گۆرانیی وتووە. گەنجینەیەی لەبن نەهـاتووی گـۆرانی رەسەنی کوردیی بـۆ بەجێهێشتووین.. بـە کـۆچـی دوایـی زیـرەک کوسـێکی گـەورە لە گـۆرانی کوردیمـان کەوت، تـا ئەمـڕۆش شوێنی زیـرەک پـڕ نەبۆتـەوە.. حەسەن زیرەک خاوەنی چریکەیەکـی جیاواز و مـوزیکزانیکی سروشتی بـوو، شاعـیرێکی

میللی خۆرسک بوو، خاوەنی قوتابخانەیەکی گۆرانی کوردییە، کە مۆرکی رەسەنایەتی کوردیی لەخۆگرتووە.

زیرەک زۆرت کرد خزمەتی هونەر
ژینت لە پێناو هونـەر بردە سەر
رۆژگـارت سـاتی بەجێ خـەم نەبوو
بەڵام لە هونـەر هیچت کـەم نەبوو

مەزهەری خالقی دەڵێت:"کورد بە هۆی حەسەن زیرەکەوە خاوەنی پتر لە (١٠٠) میلۆدییەو دەوڵەمەندترین نەتەوەیە لە میلۆدیدا"
شەمال سایب دەڵێت:"حەسەن زیرەک بلیمەت بوو، ئەو نەبوایە گۆرانی کوردی لەناودەچوو"
بەداخەوە کە ئێمەی کورد، زیندوو نەویستی مردوو پەرستین، حەسەن زیرەک تا نەمرد قەدرمان نەزانی کە چ هونەرمەندێکی گەورەو چ خزمەتێکی میلۆدیی کوردیی کردووە.
ئەمەش بەشێکە لە (لای لایە) یەکی حەسەن زیرەکی نەمر:

هـیوا و نـامـانجم ، رۆڵـە جوانـەکەم
کۆرپـەی شـیرینم ، پشـتیوانـەکەم
* * *
جـێگای شـانـازیم ، رەگـی حەیـاتم
هـۆی ژیـانەکەم ، تیـنی خەبـاتم
* * *
رۆڵە شیرینەکەم کوردستان وا چاوی لە رێتە
نیشـتمانە و هـیوای دوارۆژی پێتە

* * *

رۆڵـه چونکـه تـۆ پـاکی لـه دەرگـای یـــەزدان

بـا رزگـــاری کـا خـــــاکی کوردســـــتان

* * *

لای لایـــــــــــه ، ده لای لایـــــــــــه

## لایـه لایـەی حەمـه جەزا (١٩٤٩ ـ ٢٠١٠)

هونەرمەنـــدی گۆرانیـــبێژی ناســراوی گەلەکەمـــان، پێـــشمەرگەی شۆڕشی رزگـاریخـوازی کوردستان، حەمـه جەزا عـەلی لە سـاڵی (١٩٤٩) لە شـاری سلێـمانی لەدایکبـووە، لە تەمەنـی بیست ساڵیـدا، بـووە بە پێـشمەرگـه و بەشـــێکی زۆری ژیــانی لە پێـشمەرگـایەتـیدا بەسەربردووە. دوایش بە خێزانەوە روویـان لـه ئەورووپا کـردوە و لە وڵاتی دانیـمارک مـافی پەنـابەرێتیان وەرگـرتووە.

دوای راپـــەڕینی بەهـــاری کوردســـتان (١٩٩١) حەمـــه جەزا بـــە یەکجـاری گەڕایـەوە بۆ کوردستان.. خزمـەتێکی زۆری گـۆرانی و سـروودی کـوردی کـردووە.

هونەرمەنـد حەمە جـەزا لە (١ـ ١٠ـ ٢٠١٠) دا کـۆچـی دوایی کـرد. لە گـردی سەیـوان لە سلێـمانی بە خاک سپێرا. گەنجینەیەکی سروود و گۆرانیی کوردی بۆ بەجێهێشتووین.

حەمە جەزای ئەمر، خـاوەنی دەنگێکـی رەسـەنی زوڵاڵ بـوو، چەنـدین سروودی نیشتمانی و گـۆرانیی کـوردیی تـۆمـارکـردوون. لەوانـەش (هـۆ کـاکی پێشمـەرگـه) و (قـەنـدیل)، گـۆرانی ( مـەڕو مـەڕۆ) و (لایــه لایـــه) شی بـۆ منـداڵان وتـوون. ئەمـەش بەشـێکە لە گـۆرانی

(ممرۆ ممرۆ بـابه ممرۆ بـۆ جێیمـان دیلـی) بمداخموه بـۆ یمکجـاری به جێیهێشتن:

مــمرۆ مــمرۆ بابــه مــمرۆ بـۆ جـێمان دیلی
تاکـەی ژیـــان بـمرینـمسـمر هــمروا بـه ویلی
تاکـەی خـممی ئـمم میللـمتـه بگـرینـه بـاوەش
تاکـەی له سوزی باوکێتی دەملتکـەی بێ بـمش

ـ ئــمرۆم ئــمرۆم زویــر مـمبن ورديلـمکـــانـم
تا سمربـمستی بمدمسـت دێنـم بـۆ کوردستانـم
تاکـو ئمخشـەی ئـمم ولاتـــه ئمگــــۆرینـموه
دلنیــــابن رۆلـمکـــــــانـم ناگـــــمرێیینـموه

ئممـمش دەقـی (لایـه لایـه) کـەی حـممـه جـمزایـه:

لایــــه لایــــه رۆلــــــەی شـــــیرینـم لایــــه
بنـوه رۆلـه درمنگه لمسمر چی خـموت نایــــه
بنــوه رۆلــــه درمنگه دنیـا کـپ و بێ دەنـــگه
منیش خـموم زراوه دلـم خـممبار و تـمنـــگه
لایــــەلایــــه رۆلـــــــەی شـــــــیرینـم لایــــه
ومره ومره پێـم بلێ لمسمر چی خـموت نایـــــه
رۆلـــه که تـۆ ئمزانــی بـۆ مـن هــیوای ژیـانی
نـــاواتی دوارۆژی پـــر خـۆشی و کـامـــرانی
لایــــه لایــــه رۆلــــــەی شــــیرینـم لایـــه
رۆلـه توخوا پێم بلی لمبمر چی خموت نایـــه
شـموگــــــاری درێــــژ هــمر ئـمبـــــرێتـموه
بـاوکـــــت لـه سـمفــــــمر ئـمگــــــمرێتـموه
دیـــــاریت بـۆ دێــنـێ له کــــــاروانـی دوور

دەچـــــــێتە جـێی گـریـــــــان و نـاسوور
رۆلـە گەر تـۆ بزانی بـۆ من هـیوای ژیـانی
نـــاواتی دواڕۆژی پــڕ خۆشی و کـامــــرانی
لایـــــە لایــــە رۆلــــــەی شـــــیرینم لایـــە
توخوا وەرە پێم بڵێ لەسەر چی خەوت نایـــە
بنوە رۆڵەی شیرینم هیوای دواڕۆژی ژیـــنم
نـاواتە خـوازم رۆژی شـادیت بـە چـاو ببیــنم
لایـــــە لایــــە رۆلــــــەی شـــــیرینم لایـــە
توخوا وەرە پێم بڵێ لەسەر چی خەوت نایـــە
لای لایەی خاتمە هونەرمەندی دەنگخۆش

(لۆکە زاهیر)

لای لایـــە هـــەی لای لایــــە ، هــەی لای لایــــە
رۆلــــــەی شـــــــیرینم بـۆ خـــــــــەوت نایــــە
دە لای لایــــە لای لایــــە لای لایــــە لای لایــــە
لـە نــــاو چـاوەکـــــانـما بـنـــوو جـــــەرگـی دایـــە
نـەی پـاکـتـرین فـریشـــتـەی نـاو نـــەم دونـیـایــــە
خەونت پڕبێ لە چرۆ و گوڵ هەناسەکەم ، رۆلە گیان
خـۆزگـە دونـیـاش وەکـو خـەونـی تـۆ جـوان بـوایــــە
دە لای لای لای لای لای لای لای لای لایـــــــــــــــە
وەرە سـەر بـنی بـە دلــــەوە ، بـەرخـۆلـــــــکەم
بـە تـرپــــــەی دل لای لایــــــەت بـۆ نەکـــــــکەم
بمــبەرە نـاو دونـیـای جــوان و خـەونـێکی خـــۆت
بنـوو جەرگـــەکەم ، نـەی نیشـتـمانە بچکۆلـــەکەم

ده لای لای لای لای لای لای لای لای لایـــــــــــــــه
بنوو رۆڵه گیان ، کورپەی شیرینم بۆ خـەوت نایـــە؟

<u>لای لایەی شێخ حەمە مارف مەریوان</u>

بە زمانی خاتوو (حەسیبە)ی خێزانییەوە لای لایە بۆ کوڕەکە کۆرپەکـەکەی دەکات.

رۆڵـــە لای لایـــە کـــوڕم لای لایـــە
ئەمشـەو بــۆچی تۆ خـــەوت نایـــە
رۆڵـــە نەزانـــم هێشـــتا منـــداڵی
ســاوای نـەرم و شـل بـە گڕوگـــاڵی
بـەڵام ئەقـــەلا و نیــــدای تـۆ بۆ مـن
خستوو مێمتە نـاو ئەندێشـەی بێ بـن
هەرچـــەن بچـکۆلە و بەستەزمـــانی
ناشــێ بـۆ دنیـــا و ژینت بــــڕوانی
بڵـێی لەم دنیـــای پـــان و هـــەوارە
بۆچـی دەست و پێم مەحکەم بەستراوە
لـە نـــێو لانـــکدا بـەم جـۆرە قـەتیس
شەتـەک دراوم بـە پـــەت و گـــوریس
گوایە چیم کـرردوە بەشـی کێ ئەخـۆم؟
شـیری مەمـەی دایـکی خـۆم ئەخـۆم
هـەی لای لایـــە رۆڵـــە لای لایـــە
دنیـــا زینـــدانی پیـــاوی نـازایـــە
رۆڵـــە خـرپـــن و دڵ پەرۆشــــەکەم
هێزی دوو ئەژنـۆم جگەرگۆشـــەکەم

پێت بڵـێم بۆچـی نەسـیر کـــــراوی
لـە نێـو لانـــکدا شەقـــەک دراوی
تا خووی پێ بگری ، بە کۆت و زنجیر
بە پـــەل بەستراوی هیـچ نەبـی زویـر
دەست و پێت لە ژێـر کۆتـدا نەتـەزێ
رەمـەقت نـەڕوات ، دڵـت نـەلەرزێ
ئەو بەند و کـۆتە وەک شـێری برسی
ئـاڵـــۆزت بـــکا لە هیـچ بـترسی
بـۆ نیـــشتـمانت بـە دڵ بـجـــۆشی
بۆ سەندنی مـــاف زیـــاتر تێکـۆشی
هـەی لای لایــە رۆڵـــە لای لایـــە
پیاوی تـرسنۆک حیزی گـشت لایـــە
رۆڵـــە پەنـدی من بـۆ خـۆت و کـــاکت
بـۆ پاشـــەڕۆژی ژیـــنی روونـــاکت
ئـەم دنیـــا کـــەوا تـۆ پێت تێـــناوە
رەنـــگاوڕەنگ وەکوو بـووکـی رازاوە
زاهـیری وایـــە نـــیوەی گەنـــیوە
بە مەسەل هەر وەک زرکەی هەتـــیوە
ســاوای وەکوو تۆ تەجـــرەبەی نییە
ئاگـای لـەم بـەزم و گۆبـــەندەی نییە
بیـری وەک بابت تەجـــــرەبەی زۆرە
هەزار ئەوەندەی دنیا کە بنـکەی زۆرە
بـۆ ئـەوەی رەنجت بگـات بـە سەمـــەر
نەبـێ سەربەخـۆ لـە گـــڵ بێـــتەدەر
نابێ هـیچ وەختێ هـەل بدەیت لە دەس
هاتـو ئـەو هـەلە قـەت نەکـەوێتە دەس

داد بۆ ئەم و ئەو خووی پیاوی حیزە
کورم مسەلەس کەر بە ئەقیزە
دەخیل نامووست نەفرۆشی بە نان
سەرشۆر بوستی بەرانبەر ژنان
دەردی سەرشۆری قەت چاری نایە
لە برسان مردن لە چاوی شایە
دایکت بە هیواس کاتێ بووی بە لاو
لە ریزی پیاودا کەویتە بەرچاو
لە ژێر سایەدا بحەسێتەوە
وەک گوڵی تێراو بگەشێتەوە
وەک دایکانی تر بێت بە ساحێب خێو
پاسەوانی بێت لە جنۆکە و دێو
بە تیلایی چاو نیگای کرد هەرکەس
تێی هەڵدە تا ئەوپەری ئەتلەس
هەی لایە لایە رۆڵە لای لایە
کور علسای دەستە بۆ بابە و دایە
رۆڵە بینایم رۆڵەی شیرینم
سۆمای دوو چاوم دەوای برینم
ئاخرین پەندم زۆر پایە بەرزە
بۆ نیگارینی جێگای ئەو مەغزە
تۆ و کاکت بڕۆن خوێندن بخوێنن
مافی گەل و هۆز خۆتان بستێنن
بە خوێندن هەموو دەرد ئەبێ چارە
بێ سەواد وەکوو کوێری بێ دارە
نەک وەک زاناکان رابردووی وڵات
خۆتان مەشغوول کەن بە ئەدەبیات

با تمحقيق لمسەر فەلسەفە و حيكمەت
بەرهەمـــيان نييە عـەزيـز بـەغـــيرەت
بـە شيمی و فـيزيـک و سەرنـج لە مـادە
نەســـپابی مـــەردی نـــــەبی نـامادە
بە زوان بە قەڵەم بە رەنـج و خەبـات
گيانتــان بەخــت كـەن لە رێــگەی وڵات
بـۆ داوا و نــــزا كـەس گــوێ ناگــرێ
حـەق ئەگـەر حـەقە بە زۆر ئەسـەندرێ
ئەبـــەد نامــرێ و نـــــاوی زينــــدووە
ئـــەوەی لـە رێــگـای گـــەلا تياچــووە
هـەی لايـــە لايــە رۆڵـــــە لای لايـــە
شـەرەف گەنجـێكە هـەر دوايـی نايــــە

## لای لايی هونەرمەند حشمتوڵلا لورنەژاد (حشمت لورنەژاد) (١٩٤٧-١٩٩٥)

هونەرمەنـدی ئەمـری گەلەكەمـان (حـشـمت لـورنــەژاد) بە هەمـوو دياليكتە كوردييەكـان گۆرانيی وتـووە.. دەنگێكی رەسەنی كـوردیی هەيە. ئەمەش (رۆڵـە لای لای) يەكێكە.

هۆنـراوەی : رەحيم مەعينی كرماشانی

گۆرانی : حـشمت لـورِی

کورپەی شیرینم ، بنوە درەنگە
شەوگار درێژ و دنیا بێ دەنگە
بنوە بەرهەمی ژینی رابردووم
تەنیا ناوتی عومری با بردووم
بە تۆوە شادە ژیانی تاڵم
بۆ تۆیە گوڵم بە کوڵ نەناڵم
بنوە نازیزم بەختت بێدار بێ
هەر رۆژی ژینت هەزار بەهار بێ
نەتۆی گوڵی بەهارەکەم
رووناکی بەختە تارەکەم
بنوە کۆرپەی لەبارەکەم
رۆڵە لای لای ، کۆرپەم لای لای
جەرگەکەم لای لای
قەرارم تۆی بێ قەراری تۆم
تۆی مەرهەمی جەرگی بە کۆم
بۆت فرمێسک نەرژێ وەک چۆم
رۆڵە لای لای ، بەرخەکەم لای لای
رۆڵە لای لای ، جەرگەکەم لای لای
بە تۆوە شادە ژیانی تاڵم
بۆ تۆیە گوڵم بە کوڵ نەناڵم
بنوە نازیزم بەختت بێدار بێ
هەر رۆژی ژینت هەزار بەهار بێ

## لای لایه به دیالێکتەکانی زمانی کوردی

به هـۆی داگیرکـردن و دابەشکـردنی کوردستان بەسەر چـوار دەوڵـەتی ڕەگـەزپەرست و دڕنـدەدا، کە تـا ئەمـڕۆش ئەک هـەر دانیـان بـە کەمـترین و سادەتـرین مافـە ڕەواکـانی گەلەکەمـان نە نـاون، بەڵکـو تـا ئێستاش بە گەلەکـۆمەیی و بە شـێوەیەکی زۆر دڕنـدانـه و نامەردانە، دوور لە ڕەوشت و لە یاساکان و لە مافەکانی مـرۆڤ و لە مافەکـانی گـەلان، بە کوشندەترین و کاولکەرتـرین چەکـی مـۆدێرن و قەدەغەکـراو، دەسـتیان لە ڕەشەکـوژی و لە ژینوسایـدکردن و لە سەرکوتکـردنی گـەلی کوردمـان و لە وێرانکردنی کوردستانی نیشتمانی شیرینمان هەڵنەگرتوون.

بە هەمـوو ڕێـگا و شێوازێکـیش دژایەتـیی زمـانی کوردیمـان دەکـەن، هەوڵـیان داوە و هەوڵـدەدەن، کە زمـانی کوردیمـان کـاڵ بـکەنەوە، چـونکە زمـانی کـوردی گرنگترین کۆڵـەکە و ناسنامەی نەتەوەییمـانە.. خوێنـدن و نووسـینیان بە کـوردی قەدەغەکـردوون، بە تۆبـزی و زۆردایش و بێ خواستی خۆیان منداڵانی کوردمان فێری تورکی و فارسی و عەرەبی دەکەن، بە کولتوورێک ئاشنایان دەکەن کە نامۆن و بە منـداڵانی کورد هەرس ناکرێت.

نیـازی گـەلاوی ئەوان، ئەوەیـە کە منـداڵانی کوردمـان لە گـەلی کوردمـان هەڵگەڕێننەوە. دەیانەوێت زمانی کوردی لە بیری منداڵانی کوردمـان بەرنەوە. لەمەش زیاتریـان دەوێـت، دەیانەوێـت سـۆز و پەرۆش و خۆشەویستی و هاوبەستەبوونیان بۆ کـورد و کوردستان کـاڵ بکەنـەوە. دەیانەوێـت بـە ئایدیۆلـۆژیای بۆگـەنی تـۆرانی مێشکیان بۆگەن بکەن.

بەڵام هەروەکوو چۆن لە کوردقڕان و ژینۆساید و لە ڕێگرتن لە خەبات و تێکۆشان و کۆڵنەدانی کورد شکستیان هێنا و نەیان توانی و ناتوانن کڵپەی مەشخەڵی کوردایەتی بکوژێننەوە، ئەستەمیشە کە نیازی گڵاویان بهێننەدی و بتوانن ڕێگری لە گەشەکردنی زمانی کوردیمان بکەن یا کاڵی بکەنەوە. کوردی زمانی پەنجا ملیۆن کوردە. کۆنترین و ڕەسەنترین زمانی ڕۆژهەڵاتە. ئەمە هەر قسەی خۆمان نییە و مێژوو سەلماندوویەتی. هۆکارێکی تری یەکنەگرتنی زمانی کوردیمان، هەڵکەوتنی جوگرافیای کوردستانە.

دەرهەق بە زمانی کوردی، خۆشمان کەمتەرخەمین، تا ئێستا هاوڕانین و ڕێنەکەوتووین لەسەر زمانێکی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوەی کوردی لە کوردستان دا. دوو ئەلفوبێی کوردیمان هەیە، ئەلفوبێی ئارامی کوردی و ئەلفوبێی لاتینی کوردی.

تا ئێستا نەمان توانیوە هاوڕابین و ڕێکبکەوین لەسەر زمانی ستاندارەی کوردی کە ببێت بە زمانی یەکگرتووی خوێندنەوە و نووسین لە هەموو کوردستان دا، ئەم هیوا و ئامانجەش خواستی هەموو کوردێکی دڵسۆز و کورد و کوردستان پەروەرە.. دەبوایە یەکگرتنی زمانی خوێندنەوە و نووسینی کوردی، لە کارە هەرە پێشینەکانی حکوومەتی باشووری کوردستان بوایە.. هەر ئەوانیش دەتوانن بە شێوەیەکی فەرمی ڕای بگەیەنن و جێبەجێی بکەن. چونکە بوونی زمانی ستانداردی کوردی زیاتر گەلی کوردمان و وێژە و ڕۆشنبیریی کوردیمان یەکدەخات و زمانەکەشمان زیاتر گەشە دەکات.

له ئەمڕۆدا بوونی زمانی ستاندارادی کوردی، پێویستییەکی گرنگە و لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستیمان پێی هەیە.. چونکە نەبوونی زمانێکی یەکگرتوو و بەکارهێنانی فرە دیالێکت و فرە بەشە دالێکت لە خوێندنەوە و نووسین و لە میدیاکان و راگەیاندنەکان، زەنگێکی مەترسیدارە و زیانێکی زۆری بە زمانی کوردیمان گەیاندووە و دەگەیەنێت.

داگیرکەرانی کوردستانیش ئەم خاڵە ئەرێنییەی کوردییان قۆستووەتەوە و هانی فرە دیالێکت و زمانی ناوچەیی کوردییان داوە و دەدەن بۆ ئەوەی زیاتر لە یەکتری دابڕێین.

فرە دیالێکت کێشەی کوردی قووڵتر کردۆتەوە.. هیچی تیا بەسەر نییە گەر بە دالێکتی ناوچەیی قسە بکەین، ئەمەش بە هیچ شێوەیەک زیان بە زمانی کوردی ناگەیەنێت. قسەکردن بە فرە دیالێکت لای زۆربەی نەتەوەکانی جیهان هەیە.. بەڵام زۆر گرنگە کە ناخافتنەکانمان تێکەڵ بە زمانی نووسین نەکەین.. ئەوەی جێی داخ و نیگەرانیمانە ئەوەیە کە زمانی ناخاوتنی ناوچەیی لە زۆربەی دەڤەرەکانی کوردستان دا، بووەتە زمانی نووسین.. بەڵام نەتەوەکانی تری فرە دیالێکت، بە یەک زمان دەنووسن. بۆ نموونە (سویسرا) کە بە سێ دیالێکتیکی جیاواز قسەدەکەن، بەڵام یەکێک لەم سێ دیالێکتیکەیان کردووە بە زمانی ستانداردی نووسینیان و هیچ کێشەیەکیشیان نییە.

بە پێویستی دەزانم لەسەر ئاستی هەموو کوردستان دا، لە لایەن کۆمەڵێک لە پسپۆران و شارەزایانی زمانی کوردیمان (ئەنیستیتۆی زمانی ستانداردی کوردی) دابمەزرێنن و لە لایەن حکوومەتی کوردستانەوە، شوێن و بودجەی پێویستیان بۆ دابین بکەن.

کـاری یەکەمـی: ئەم ئەنیـستیتۆیەش دانـانی فەرهەنگێکـی زمـانی یەکگرتووی کوردی بێت.

کـاری دووەمیـشیان: دانـانی رێـزمانی کـوردی و دەسـتووری دروسـتی رێنـووسی کوردی بێت، بە رێنووسـی کوردی نـارامی و رێنووسـی کـوردی لاتیـنی.. بـۆ ئەهێشتنی کێشەکانی رێنووسـی کوردیمان.. خەمخـۆرانی هـێنانەدیی ئەم ئامـانجە ئەتـەوەییەمـان زۆر کەمن.

راستە کە ئەمە کارێکی هێندە ئاسان و بێ گرفت نییە، کە بە شەو و رۆژێـک بێـتە دی. بەڵام لە سـایەی بڕیـاری بوێـرانە و یەکەمـین هەنگـاوی کـرداریـدا، ئەستەم بـوونی نییە، گەر بمانەوێـت هەمـوو هـیوا و ئامانجێـک دێنەدی، بێگومـان هێنـانەدی ئامـانجی گەورەش هەوڵـدانی کرداریی گەورە و ماندووبـوونی زیاتـر و خـۆڕاگـری و کۆڵنەدانی دەوێـت.

لای لایە و لوری دایکانی، کوردمان بەشێکی زۆریان بە دیالێکت و بەش و لقە دیـالێکتە جیاوازەکـانی نـاوچەیی وتـراون و نووسـراون، بە رێنووسـێکی نـایەکگرتووش نووسـراون. هەڵـبەتە ئـەو نووسـەرە دڵسـۆزانـەی کە لای لایـە و لـوری و گـۆرانییەکـانی دایکـانیان بۆ منـداڵان کۆکـردوونەتەوە و بڵاویـان کـردوونەتەوە.. لەبـەر رەخـنە، دەسـتکاریی هـەڵە رێنووسـەکانیان نەکـردوون. سـەرەڕای جیاوازییەکـانی دیالێکتەکـانی زمـانی کوردیمـان، لای لایـە و لـورینی کوردیمـان لە نـاوەڕۆک و مەبەسـتـدا یەکـن و هەموویـان تایبەتمەندیی و سیما و مـۆرکی رەسەنایەتی کوردییـان پێـوە دیارە.. ئەم فـرە لای لایـانەش رەنگینـی و جـوانی و دەوڵەمەنـدییەکی زیاتـریان بە لای لایـە و بە فۆلکلـۆری کوردیمـان بەخـشیوون. لای لایـە وەکـوو ئەدەبـێکی فۆلکـلۆری میلـلی، نـەک هـەر لـە

کوردستان دا، بەڵکو لە فولکلۆری زۆربەی گەلانی جیهانیشدا، وشە و رستەی ناوچەیی و دیالێکتی جیاوازیان پێوە دیارە. بەڵام چی نەوانن بە زمانێکی ستاندارد و بە رێنووسێکی سەپاو دەنووسن.

بەپێی دیالێکتەکانی زمانی کوردی (کرمانجی، لوری، گۆرانی، زازایی) و بەش و لقە دالێکتەکانی ناوچەکانی کوردستان، بە دەیان لای لایە و لوریی کوردیمان هەیە. چەند لای لایە و لورییەک دەخەینە بەر دیدی خوێنەرانی کوردمان.. دەستکاری وشە و رێنووسەکانیشمان نەکردوون، تەنها هەڵە زەقەکانمان راست کردوونەتەوە.

حەزیش ناکەم نامازە بە ناوی ئەو دیالێکتیکانە بدەم، کە لای لایە و لورینەکانیان پێ وتراون و نووسراون، زمانی کوردی دایکی هەموو دیالێکتیک و بەش و لقە دیالێکتەکانی کوردییە. بەڵام ناچارین کە ناوی دەفەرەکانیان یا شارەکانیان بهێنین.

# نموونه لە لای لایەی دایکان کورد

پێشتر باسمان کرد، کە دایکانی کوردمان، نموونەی دایکانی دڵ پڕ لە سۆزداری و دڵسۆزی و میهرەبانی و خۆشەویستین لە هەموو جیهاندا، دەوڵەمەندترین دایکانن لە لای لایەدا. هەر ئەمەش جیاوازی و تایبەتمەندی پێ بەخشیون و کورد بووە بە خاوەنی سەدان لای لایەی خۆش، کە مۆرک و شەقڵ و رەسەنایەتی کوردییان پێوە دیارن. هەر لای لایەکێش چیرۆکێکی لەخۆگرتوون و باس لە نەهامەتییەکان و کوێرەوەرییەکان و نازارەکانی کورد دەکەن. گەلێ لای لایەی شێوە تانە توانجمان هەیە کە بە راشکاوی لە داگیرکەرانی رەگەزپەرست و ستەمکاری کوردستان گیراون. لە لایەکی تریشەوە گەر ئەو کوێرەوەری و نەهامەتییانەش نەبوونایە رەنگە ئەو لای لایانەش بوونیان نەبوایە.

لای لایەی کوردیی زۆرمان هەیە، چەپکێک لە لای لایەی دایکانی کوردمان دەخەینە بەرچاوی خوێنەرانی کوردمان.. بەو هیوایەی وەکوو بەشێک لە ئەدەبی منداڵان و لە ئەدەبی میللی و لە فۆلکلۆری رەسەنی کوردیمان سوود و چێژیان لێوەربگرن:

دایکێکی کورد بە دڵی پڕ لە خەمەوە، لای لایە بۆ کۆرپەکەی دەکات کە خەو بیباتەوە. بە غەوسی بەغدا و بە وەیس و بە فریشتەکانی دەسپێرێت کە ئاگایان لێی بێت.. نزای گەورەبوون و تەمەندرێژی بۆ دەکات، کە هێندە بە تەمەن و پیر بێت دەستی رابکێشن:

لای لایــــه کورپـــــم لای لایــــه
رولــــه بخـوه بـۆ خــوت نایــــه

* * *

لای لایمت بۆ دەکەم لە پیردەروێشان
نەوەنــدە پیر بێت دەســـت بکـێشان

* * *

داری بێشکەکەت لە دار خورمــایە
رۆلـەم سـپـێردەی غـەوسی بەغـایە

* * *

داری بێــــشکەکەت لە دار چنـــارە
رۆلـــەم ســـپێردەی وەیسی نـــازارە

* * *

لای لایمت بۆ نەکەم لایە وە نـــازێ
پەروپۆی سەرێنت پەروپۆی قـــازێ

* * *

لای لایمت بۆ نەکەم خەو بتباتـەوە
فریشتەی وە خێران بێت وەلاتـەوە

* * *

داری بێــــشکەکەت داری قـــەزوانە
بەنـی دەســـرازەت خـوری کـــاوڕانە

* * *

لای لایمت بۆ نەکەم خـەوت لێ کەوێ
دەرد و نـــازارت لـە کـــێوان کەوێ

* * *

لای لایمت بـۆ نەکـەم وە لاتــکەوە
یاخــوا گــەورەت کـەم وە بـاوکـــەوە

* * *

لەی لایەت بۆ نەکەم بە دڵی پڕ خەم
بەڵکو گەورەبیت بگـــەیتە بەرهەم

* * *

لای لایەت بۆ نەکەم تا بێ خەیاڵ بیت
بۆ خۆت پەروەردەی کوڕی مناڵ بیت

* * *

لای لایـــــە رۆڵــــــەم لای لایـــــە
خۆزگە لای لایەی عالەم وا بوایـــــە

<u>لای لایـەی دایکێکی تر:</u>

رۆڵـەم لای لایــە کوڕیـەم لایــە لای
جگەرگۆشــەکەم کوڕیــەم لایــە لای
رۆڵــە خــەوت بێ خــەوی نــازت بێ
سەحرا و سەرزەوی پایە نــازت بێ

* * *

رۆڵــەم لای لایــە کوڕیــەم لایــەکە
سلێی چـاو لە چـاو نەم دونیایــەکە
رۆڵـــەی نازیــزم جگەرگۆشــەکەم
نــــارامی دڵــــی پـــڕ خرۆشـــەکەم

* * *

بینـــای چـــــاوم رۆح و رەوانــــم
دڵ خۆشی دڵــــم نـــارامی گیانــم
رۆڵــــەم لایــەکە کوڕیــەم بخــەوە

دونیـــا بێ دەنـــگە تاریـــکە شـــەوە

* * *

بخــەوە رۆڵـــە رۆیـن لە بــەرت بێ
باڵـی فـریـشـتە باڵـکــێش سـەرت بێ
رۆڵـە لای لایــە کورپــەم درەنــگە
تاریـــکە شـــەوە دونیـــا بێ دەنـــگە

* * *

رۆڵـــە بۆ خــاتر نـــەوەڵان لە کۆ
دایـــە نەوینێ مـــەرگ دیـــەی تۆ
رۆڵـەم لایـە لای کورپـەم خـەوت بێ
دەس فـریشتەکـان لە ژێـر سەرت بێ

## لای لایەی دایکێکی تر:

ئەم دایکە لە لای لایەکەیدا، گوزارشت لە سۆز و دڵسۆزی خـۆی دەکـات و لە دەوری کورپەکەی و بـاوکی دەگەڕێ. نـزای ئەوەش بۆ رۆڵەکـەی دەکـات، کە سەرنەنێـتەوە بە جـوانەمەرگی، خـۆزگـەی ئـەوەش دەخـوازێت، کە قـەت رۆڵـەکەی رەنجـەڕۆی نـەکـات. ئەمەش نـــزا و هـــیوا و خـــۆزگەی هەمـــوو دایکـــان و باوکـــانە بـــۆ جگەرگۆشەکـانیان. ئەم دایکە غـەریبە دەربـەدەرە، بە ژێـربـوونەوەی کورپـەکەی دڵی بـریانی نـارام دەبێـتەوە.

رۆڵـــــــە شـــــــــــــیرینەکەم لای لای
بەرخــــــــــــــــــــــــەکەم لای لای
لای لای شـــــــــــــیرینت بـۆ دەکەم

رۆڵـــــــە شـــــــــــــیرینەکەم لای لای

* * *

غـەریبـە دەربەدەرکـەم ، بـە لانـــــکتەوە
لـە دەورت دەگـــــــەڕێم بـە بـاوکـــــتەوە
ژێـــربەوە رۆڵـــەی ژێـــر و جــــوانەم
نـــارام کــــەرەوەی دڵـــــی بریـــــنەم

* * *

هـــیوا و نـاواتـــــم ، رووحـــی رەوانـــــم
جگەرگۆشــــەکەم ، بیـــنای چاوانــــم
لای لایـــە دەکـــــەم بـە زەمــــانی کوردی
سەرنـەنێـــتەوە بـە جــــوانە مـەرگی

* * *

لای لایـــەت بۆ دەکــــەم بە غــەریبی
راتـدەژێــــــنم لـە ســـــێبەر داری بی

* * *

لای لایـــە رۆڵـــەی جــوانەم لای لایــە
خـۆزگە قـەت رەنجـەڕۆت نەکردەیـــە

## لای لایەیەکی دایکێکی کورد ـ لە مەهاباد

دایکێکی کورد لە مەهابادی پایتەختی کۆماری کوردستان، بە دڵ و بە گیان لای لایە بۆ کوڕەکەی دەکات و نزای نەوەش دەکـات کە جـەرگی نەسووتێ. ئەم دایـکە لە دوا دێڕی لای لایـەکەیـدا، بە بـێ تـرس، پلار و تـوانـج لـە شـای گۆڕبەگۆڕی ئێرانـی (رەزا شـا)ی داگیرکەری رۆژهـەڵاتی کوردسـتان دەگرێت، کە ستەم و تاوانێکی زۆری لە دژی گەلی کوردمـان ئەنجامـدا، لە ئەمـڕۆشدا ئاخوونـــدە

درنده رەگەزپەرستەکانی کۆماری سێدارەی ئیسلامی، نامەردانەتر و درندانەتر درێژە بە سیاسەتی رەگەزپەرستی و پاکتاوی نەژادی دەدەن.. ستەم و تاوان و ناهەقییەکی زۆر لە گەلی کوردمان دەکەن. رۆژ نییە کە بە ناڕەوا پەتی سێدارە نەخەنە ملی لاوێک یا مێردمنداڵێکی کورد، یا بە گوللە کوولەبەرێکی هەژار و بێدەرەتانی کوردمان نەکوژن.. بە هەزاران کوردیشیان زیندانی کردوون.

تورکیای زیندانستان و رەگەزپەرستی داگیرکەری باکووری کوردستانیش نامەردانەتر و درندانەتر، بە گەورەترین لەشکری درندە و بە تازەترین چەکی کوشندەوە، بە بەرچاوی جیهانەوە خەریکی رەشەکوژی و کۆمەڵکوژی کوردن.. هەر لەبەر ئەوەی کە کوردین. بەڵام هەرگیز ئەو نیازە گڵاوەیان نایەتەدی، کە بتوانن چۆک بە کورد دادەن یا بتوانن لە خەبات و تێکۆشانمان لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان، رامان بگرن.

گەر مللەت دێشنی بە پەتی زاڵم
سەرکە سەر رانم قەزات لە ماڵم
لای لایەت بۆ دەکەم بە رشتەوە
نەمێنی رۆڵە شەو لە دەشتەوە
لای لایەی خەڵکی بەسەر زەمانە
لای لایەی دایکت بە دڵ و بە گیانە
لای لایەت بۆ دەکەم بە دڵ و بە گیان
خەوت لێکەوێت تا بەری بەیان
لای لایەت بۆ دەکەم خەو بتبباتەوە
فریشتەی خێران خەبەرت کاتەوە
لای لایەت بۆ دەکەم بە رووی سوورەوە

خـوا جــــەرگم نـــەدا بـە تـەنــوورەوە
لای لایـەت بۆ دەکـەم بـە دڵ و بە گـیان
ئـاگــادارت بێت شــێخی کەســــــنەزان
سـەت دارم لـــێدەن داری میمـــووکێ
لانـک هەڵــدەگرم دەچـمە کەرکــووکێ
مـــاڵم بۆچـیـە؟ گەنجــی بـە کـۆ بـێ
گـــەدایی دەکــەم چـــــاوم لە تـــۆ بـێ
یـا سـوڵــتـانی مــاڵ لـەو قـەد بــەرزە
کۆرپەکەم نەگری قەت تـەپ و لــەرزە
لای لایـەت بۆ دەکـەم بە دڵ و بـە گـیان
خـوا بتپـارێـــزێ لـە بــەڵای رەزا خــان

یـان دوعـا لـە بـەدگـۆیـان و لە دوژمنـان دەکـات و دەڵێت:

لای لای رادەکــەم وە گـــول قرمـــزی
خـوا بـکە بەدگـۆیان چـرایان نەسـووزی
لای لای دەکــــــەم تـا خـــور بنیــــشێ
خوا بکەی دوژمنانو وە شادگ نەنیـشێ

<u>دایکێکی تر:</u>

لای لای نـەمـــــامی بەخـــتـم
هـاوڕێی هـەورازی سەخــــتـم
رێگـــــای چـــیا زۆر دووره
رێگای پـڕ لە خوێن و سووره
بخەوه کۆرپـەی شیرینی دایـە
* * *
دایـکـت دەنــــــگی دەرنــــایە

گریـــان لە گـــــەرووی دایە
ژیــــنی کـــــــورد بۆ وایە
لای لای نـەمـــامی بـەخـــتم
گـــەرمی ڕۆژانـــی سـەخـــتم

دایکێکی تـر:

خۆزگـــەم بە مـەلان هـەر شـەو لە شـاخێ
نەک بە دەستەی خـۆم هـەر نـاخ و داخێ
بە تـانـــەی دۆسـت و بێگانەکـــان خـــۆم
بە وێنـەی فەرهـــاد وێڵی کێـوان خـــۆم
نـازیــــز بـە مــــەرگت گـرانـــــــە دەردم
کـــاتێ بــــــژنەوم نـــــەوا مـــن مـــردم
لای لایــەت بـۆ دەکـەم بـە عـەودالی کۆ
یا خـــوا کــەس نـەگـــرێ نەدامــەتیی تـۆ
هـەی لایـــە لایـــە کـۆرپـــەی ســـاوایە
کوێـربێ ئـەو چـــاوەی بـە تـۆ هەڵنـــایە
هـەی لایـــە لایـــە کـۆرپـــەی ســـاوایە
دایـــە مـانـــدووە بـۆچ خـــەوت نـــــایە

خۆزگەی دایکێکی کورد

لە گۆڤاری گەلاوێژی ژمارە (٨)ی ساڵی (١٩٤٣)دا، دایکێکی کوردمان (کەناوی نەنووسراوە) خۆزگەی ئەوە دەخوازێت کە نەزانین وجیاوازی لە نێوان کچ وکوڕدا نەبوایە، دەڵێت:

هەی لای لایە کچم لای لایە

خۆزگە لەم جەهلە رزگار بوونایە

هەی لای لایە کچم لای لایە

دەبا کچ وکور وەك یەك بوونایە

## لای لایەی دایکانی کورد ـ کەلهور

ناوچەی کەلهور لە رۆژهەڵاتی کوردستان دا، زۆر دەوڵەمەندە بە لای لایەی رەسەنی کوردیمان، بە دەیان لای لایەی کوردیمان هەیە. لەم لای لایەیەدا، دایکێکی کوردی کەلهوری کۆرپەکەی دەلاوێنێتەوە بۆ ئەوەی بنوێت.. دوایش پێی بگرێت. دواتر بە خەیاڵ وەکوو لاوێکی هەژدە ساڵان لە کوڕەکەی دەڕوانێت و کوڕەکەی ناوی بۆ سەربازی هاتووە. لە رێگای کرماشان رایەخی بۆ رادەخات کە پێیدا بڕوات و بێت. دوایش دەیەوێت ژنی بۆ بهێنێت. داوا لە ماڵان دەکات کە کێیان کوڕەکەی دەکەن بە زاوایان. دەیەوێت خاڵیشی کچەکەی بە خەڵات بداتێ.. لە لای لایەی ئەم دایکەدا، دایک بەسەر سنووری کات و تەمەن دا بازدەدات، بە خەیاڵ و دڵی خۆی منداڵە کۆرپەکەی گەورە دەکات، یەکسەر لە نێو لانک و دوای پێگرتن.. دەیگەیەنێتە کاتی سەربازی وژن هێنان:

لاوە لاوەکەم کوڕەکەم بخەفێ

هەر دەردێ دیری لە خومم بکەفێ

گلێپارەی زەری بسازم لە چوو

ئەمرا کوڕەکەم هە بایەد و بچوو

لاوە لاوەکەم لاوەکەم دووانە

یەکــی شــــیرینە و شــــکەر زوانـــــە
لاوە لاوەکـــــــەم نـــەرا یـــەی تەفـــــلی
شەمـــــاڵ بشـــەنی زەنجیـرەی زولـــفی
ریــگەی کرمـــاشـان فـەرش کەم لە قـالی
نـەرا کـورەکـــــەم تــــازە نیجـــباری
ماشــینێ هـــاتیە وەرگــــەی ســـەوزە
کورەکــەم هــا لـە نێی رەیـسی هـــەوزە
ریـــگەی کرمــاشان بخـــەم لـە کونـــجی
کورەکـەم هــا نـەورە سێـول نارنـــجی
ماشــینێ هـــــاتیە پــــڕی قرووشـــــە
کورەکەم ها لە نێی مێخەک فـرووشـــــە
هە مـــاڵێ گیسکێ خـوەم تەنیـا گـــورێ
وە نـــەزری نـــەڵا کورەکـــەم نەتـــورێ
دارەگــــەی وەرمــــــــڵ شـــنە شـــنیە
خـوەزیمــە و کـورەگـەم وەختـی ژنــــیە
لاوە لاوەکـــــــەم بــــــــەر بـــــــارێ
خوەم پاخەسیور بووم دەزیـوران بـــارێ
هـــەی مـالەیلەگـان مـالتــــــان نــــاوا
کـێتان کـورەکـــــەکەم کـــریـن وە زاوا
لاوە لاوەکـــــەم کـورەکـــەم پـا بـــــگرێ
لە مــــاڵی خـــاڵـو یـەک یـەک لابـــگرێ
خاڵــو وە خـــەڵات وە پـیـد بەی دیـوتێ
داڵـــکە بێ خــــەڵات وە بـــــاوان نیـــەتێ
خاڵـوژن نـــەدای ریشـــیر لــید بـکەی
لاوە لاوەکــــــەم نــــەرا تێ نیـــوشەم
دەسـماڵ گـول وەنـی کـــڵاش نـاورێــشەم

له بـەرزی بـاڵای لە تەنگی کەوشی
شەمـاڵ مەشـانوو بـاڵای بێ خەوشی
لاوە لاوەکـــــەم لاوەم یـــــارد بوو
خـودای بـــان سەر نـاگـــــادارد بوو

یان دەڵێت:
کوڕەکـــەم چییە وە شـــار بۆکـــــان
تـا شـــــاڵ بـاوەی پـــــەری دەزوڕان
کوڕەکـــەم چیـە وە شـــار هـەولـــێر
گـوڵاو بـاوەی ژن پێ بکـەی سـوێر

## لای لایەی دایکانی کورد ـ لە لورستان

نـاوچەی لوڕسـتانی جـوان و قەشـەنگ مەڵبەنـدی شۆڕشـەکەی ژنە سـەرکردە و قارەمـان و شۆڕشـگێڕی کوردمـان (قـەدەمخـێر)ی پـــــۆلایین.. کە کۆشـــــکی بەهەڵمویـــــی هێنـــایە لەرزیـــــن. لوڕسـتان و خوراسـان کە هەردووکیـان دوو بەشـن لە کوردسـتان، مەڵبەندی سـەرهەڵدانی هـونـەری رەسـەنی موزیـک و گـۆرانی و لای لایـەی کوردیـمانـن. بـە سـەدان دایکـانی لایلایـەبێژ لـەم دوو دەڤەرەی کوردسـتان دا، لای لایـیان بـۆ کـۆرپەکـانیان چڕیـون. بەڵام بە هـۆی نەنووسینەوە و تۆمـار نەکـردنیان، بەشێکی زۆریـان لەبیرچوونـەتەوە.

ئەمە لاوە لاوەیـەکی دایکـێکی کـوردە، لە دەڤەری لوڕســـتان لە رۆژهـەڵاتی کوردستان:

لاوه لاوەکـــــــەم ، لاوەم شـــــــیرینە
کــردم وە نـــــەزر نـەو مـــاڵ و مـینە
لاوه لاوەکــــــەم نــەرای تـۆ نـویشــــم
دگـــان مـــرواری ، کـاکــۆڵ نـورێشـــم
لاوه لاوەکـــــەم ، نــــێـوارە وەخــــتێ
دەنگ کوورپـەم تێ لە سای درەخـــــتێ
لاوه لاوەکـــــەم خـەیـــــاڵەی خـــــاوان
زەمـزەمەی مـەلان ، ناڵەی وەفـــــراوان
لاوه لاوەکــــــەم ، لاوەی نــــــــازاران
وەدەنــگ نـــــەرم و وە پـــرزەی واران
گـــــاپارەد بەســـــام ، لــەێ دار وەنـــە
وە حـوکـــــم خــــودا ، وەزور بـەنـــە
لاوه لاوەکـــــــەم ، لاوەم نـە لـــــووری
خــەو لـە گـلارەێ کـوورپـەم نەتـووری

لای لایەیەکی تری دایکانی کورد ـ لە لورستان ـ کطهور

ئـەم دایـکە کوردەمان، بە جـوانی کورەکەی هەڵدەدات و باس لە نازایەتی و سوارچاکی دەکات، کە تـوانی پێش لە لەشکـری رووم بگـرێت و دیـلی ئێرانیان لـێ وەربگـرێتەوە:

لاوە لاوەگــــــەم نـەرای تـۆ نـویشـــــم
دیــــان مــرواری کـاکـــۆڵ نـورێشــــم
* * *
کـورەکەم ها وە کـۆڵ کەرگـەدەنـــەوە

نەسیر نـــیران وە روم سەنـــمەوە

* * *

کورەگەم ها وەکول چوارپەل بـازمەوە
تریـگەی تەولـی تـێ لـە شـیرازمەوە

* * *

کورەگـەم هـــاتەوە لـە بـازرگـــانی
مـاڵ و مـین بیـەم گـشت وە مـزیـــانی

* * *

لاوە لاوەگـــــەم بــــود بـــــاری
خوەم بوم وە پاوە و کورەگەم ژن باری

## لای لایەیەکی تری دایکانی کورد ـ لە کەلهور

نـەری وەفیدای بـاڵات بـام نـازیزم رۆژی چـوار جـارە
نـەری سـوبح و نیـمەرو نـازیزم عـەسـر و نیـوارە
لای لای لای لای کیـژۆلـــەی چـــاو کـەژالـــــم

* * *

نـەری وەفیـدای ماڵەکـــەی نـازیزم پـای پەروات بـلم
نەری وەفیـدای دوو دیـــدەی شـــووبی خـــودا بـلم
لای لای لای لای کیـژۆلـــەی چـــاو کەژالـــــم

* * *

نـەری ئەمشـەو چـەن شـەوە نـازیزم دوور لە یـارانـم
نـەری وەک باخچـەی بێ نـاو نـازیـزم تـشنەی وارانـم
لای لای لای لای کیـژۆلـــەی چـــاو کەژالـــــم

## لای لایەی دایکانی کورد ـ لە هەورامان

هەورامان ناوچەیەکی شاخاوی جوان و دلگیرە.. جێی سەرهەڵدانی ئاینی زەردەشتی و فۆلکلۆر و داب و نەریتی رەسەنی کوردەوارییە.. جێی جلوبەرگی نەتەوایەتیمانە.. بە ناوبانگە بە کلاش چنین وبە گوێزی ناسک و بە بنێشتی کوردی.. هەورامان مەڵبەندی گۆرانیی سیاچەمانە و هۆرە و باڵۆرە و لای لایەی کوردییە، تا ئەمڕۆش پارێزگارییان لە لە داب و نەریت و لە جلوبەرگی نەتەوایەتیمان کردوون. لای لایەکی هەورامی:

نوسا کار خاس جە دار مەڵهەمی
بێشکە و پەی تۆشۆ گڵێنە و چەمی

* * *

سەرین و سەرەیت پەڕوزە ڕەژا
پڕ بۆجە بۆنۆ و گوڵاڵەی و کەژا

* * *

دەس پێچێنەکەت مەرزەی خەلم بوو
هەڵقەی شەش بەنش تەڵای تەمەلم بوو

* * *

گلونگ و دەسرازەت هەنکاری بوو
سەربێشک هەورێشم جە مرواری بوو

* * *

پەی تۆ نینە گرد مەن کەردەنم جەم
ئاواتەو سەوایم تۆ بۆسی بێ خەم

## لای لاپەڕەکی دایکانی کورد ـ لە بادینان

ناوچەی بادینان لە باشووری کوردستان لە شاڵاوەکانی (ئەنفال)ی بەدناودا، پرۆسەی ژینۆسایدکرنی کورد و کاولکردنی کوردستان، پێش دەست پێکردنی قۆناغی هەشتەمی شاڵاوەکانی ئەنفال لە (دەڤەری بادینان) لە لایەن فڕۆکە جەنگییەکانی عێراقەوە زیاتر لە شەست گوندی ئەم دەڤەرەیان کیمیاباران کرد، بە دەیان هاوڵاتی کورد بە ژاری کیمیاوی شەهید بوون، شاڵاوی ناوچەی بادینان، قۆناغی هەشتەمین و دوا شاڵاوی ئەنفال بوو، کە هێزێکی زەبەلاحی سوپای دڕندەی عێراق و چەندین فەوجی جاشی ناپاکی کورد، چەندین فڕۆکەی جەنگی لەم شاڵاوەدا هێرشیان کردە سەر ئەم ناوچانە (زاخۆ، باتوفە، نامێدی، شێخان، ئاکرێ، ئەترووش، زاویتە، ئیمینکی، زێوە، دێرەلوک، کانی ماسی) شاڵاوی هەشتەم لە (٢٥ی/ ئاوگوست/ تا / ٦ی سێپتەمبەر/ ١٩٨٨)ی خایند، بە هەزاران کوردی بێتاوان شەهید کران و (١٣٣٦١) هاوڵاتی سڤیلیان گرت و لە بیابانەکانی خوارووی عێراق زیندەبەچاڵیانیان کردن، تا ئەمڕۆش گۆڕونن، هەر لەم شاڵاوەدا (٣٠٠) خوشک و برای ئێزیدی کوردمان گیران و ژینۆساید کران و شەهید بوون، ئەوانیش گۆڕونن. ئەنفال، تاوانێکی بێ وێنەیە لە جیهاندا، کارەسات و تراژیدیایەکی هێندە ناخ هەژێنە، ئەستەمە کە تا کورد لە سەر زەمین دا بمێنێت، ئەم تاوانە قێزەوەنانە و ئەم نامەردییانەی شۆڤێنی عەرەبی لەبیربکەن. تاوانی کۆمەڵکوژی (٥٠٠٠) کورد بە ژاری کیمیاوی لە هەڵەبجە

تاوانی کیمیاباران کردنی چەندین ناوچە و گوندی تری باشووری کوردستان، بێجگە لەو ژمارە شەهیدەی هەڵەبجە، بە سەدان کوردی تریشمان بە بۆردوومانی کیمیاوی شەهیدبوون.. تاوانی شەهیدکردنی (١٣٠) کورد لە سەردەشت لە رۆژهەڵاتی کوردستان بە کیمیابارانی فرۆکەکانی عێراق.. تاوانی شەهیدکردنی (١٦٣) کورد لە ساڵی (١٩٧٤) لە قەڵادزێ بە بۆردوومانی فرۆکەکانی عێراق.. تاوانی هەوڵی قڕکردنی کورد، کە (١٨٢) هەزار کوردیان ئەنفال کرد و زیندەبەچاڵیان کردن.. تاوانی زیندەبەچاڵکردنی (٨٠٠٠) هەزار کوردی بارزانی.. تاوانی شەهیدکردنی (١٢) هەزار لاوی کوردی فەیلیمان کە خستیانیانە نێو حەوزی تیزاب و چەکی میکرۆبی وو گازی ژەهراوییان لەسەر تاقی کردنەوە.. تاوانی کوشتن و ئەنفال کردنی (٥٠٠٠) هەزار کوردی ئێزیدیمان لە لایەن داعشە ئیسلامییە دڕندە و بێڕەوشتەکان. ئەمانە و بە دەیان تاوانی تر.. ئەمانە و بە هەزاران برینداری کورد.. ئەمانەن کردەوە و نامەردییەکانی شۆڤێنی عەرەبی، ئەمانەن کولتووری بۆگەنی رەسەنی ئەوەکانی خەلیفەکان. کە پێویستە ئەوە لە دوای ئەوەمان ئەم تاوانانە بۆ یەکتری بگێڕینەوە، رۆژانەش تف ونەفرەت لە تاوانباران بکەین.

بادینان دەڤەرێکی گرنگی کوردستانە، زۆر دەوڵەمەندە بە سترانی فۆلکلۆری رەسەنی کوردیمان، دەوڵەمەندە بە لای لایە و لورییە دایکانی کوردمان بە دیالێکتی کرمانجی. ئەمە نموونەیەکە لە لای لایەی دایکێکی کوردمان، کە گوزارشت لە نازارەکانی ناخی دڵی دەکات، کە نامەردانی رژێمی رەگەزپەرست و دڕندەی بەعسی عەرەبی بە نامەردی هاوسەرەکەی و براکەیان شەهید کردن. ئەم

دایکە کوڕە لاوەکەی بە هیوا و بە گوڵ و بولبوول و بە دەرمانی برینی دڵی بریندار دەزانێت. بە شەهیدبوونی هاوسەرەکەی و بە هەزاران شەهید و بە هەزاران بێ سەروشوێنکراوی ڕۆڵەکانی گەلی کوردمان، داخ و کەسەرێکی زۆر چۆتە دڵی ئەم دایکە و هەموو دایکانی دڵ بریندار کوردستان.

ئەم دایکە بە لای لایە و بە لاواندنەوە، کەسەری ناخی دەردەبڕێ و داواش لە کوڕە لاوەکەی دەکات کە نەگری، گەورەبێت و بەرگری بکات و تۆڵەی باوکی شەهیدی بکاتەوە و زام و برینەکانی دڵی سارێژبکات.

دەقی ئەم لای لایەیەی دایکێکی دەڤەری بادینان لە پەرتووکی (لایلایە دایکانی کورد: کۆکردنەوەی هاشم سەلیمی و عوسمان محەممەد هەورامی ) یەوە وەرم گرتووە:

رازێ رازێ گولا دل
گولا دلێ تێژی کول
نەگری، نەکەی غولە غول
چ دنێری چاڤێ زل
دلێ دایێ د کێ کول
نیسترا گەش د کێ شل
لە ناڤ گەلەک چیا و چل
بارێ دێلیێ ل سەر مل
ئەز گریامە، تۆ نەگری
مەزنبە بۆ بەرگری
تۆلا باڤێ ڤەگری
* * *
لاوێ من لایێ لایێ

دەوسا باڤــــا تەمــایـی
نـــەم ســــوتلاندن تەمــایـی
کـــــرن ئـاگــــــردا دایـی
بـۆ مە شـــینە هەر شـایـی
خوپـــانە گـــشت نـاڤـایـی
ل ناڤ خـــــوونی وەردایـی
تـالانـــــــکرن هــەر لایـی
نــەز گـریــامە تـو نـەگـری
مەزنـــــنبە بـو بـەرگـری
تــو لا بـاڤـــــــتی ڤەگـری
* * *
گـــولا بــاغـچـــی دلـــی مـن
تـو دەرمــــانی کـــولـی مـن
قەمتیـیا سوور گـولـی مــن
پـاک کـە چـاڤـی شـلی مـن
هـلــدە بــــاری مــلــی مـن
ئــــاخ بـریــــنە دلـــی مـن
بـن دەســـتایە چـــلـی مــن
هـەی گـــول و بلـــبلـی مــن
نــەز گـریــامە تـو نـەگری
مــــــەزنـــبە بـو بـەرگـری
تـــو لا بـاڤــــــاتی ڤەگری
* * *
سەرگــــەردان و دەرڤـــەدەر
رووت و برســـی، بێمـەفەر
لەژێـر سونـکی و خەنجـەر

ب دل و جـەرگێ کەرکەر
هەنـــــاڤێ تە فـداکە سەر
ڤـــــیژیا وەک کـــورە دەر
ژێـرلە مـێ نـە کەسـێ کەر
دلــێ کـول و روویێ زەر
نـــەز گـریــلمە تۆ نەگری
مەزنـــــــنبە بۆ بەرگـری
تـۆ لا بـاڤـــــلێ ڤەگـری

* * *

ب پێنخـاسی، ب سـەر قـوت
تەکو تەکو، جوت بە جـوت
ڤـــان زوردارێن پـلـیموت
خان و بیەرێ مەڤان سوت
کـــــەزێ زەرێ مە فـرۆت
گەنجـێ مە کرن گەل خۆت
نـاخ کەچکرن کەسکولۆت
ڤەرسێن ژێـر نیـرێ جۆت
نـــەز گـریـامە تۆ نەگـری
مەزنـــــــبە بۆ بـەرگـری
تـــۆ لا بـاڤـــــلێ ڤەگـری

* * *

لاوۆ دلــــــێ مـــــن زامـــە
تـە کوشـتن خــال و مـامـە
دایـــکا تــە مەبیــە مـامــە
دوژمـــــــنێ در هـــێرامــە
تــەڤێ بەفــــرێ نـافـیامـە

د گـمل دیـــــلا زوریامـه
نـــــمز هێـــــڤیا لاومـه
کـــــاری چـــابـه دوزامـه
نـمز گـریـــامه تۆ نەگـری
ممزنــــــنبه بـۆ بـمرگـری
تـــۆلا بـاڤــــــتی ڤمگری

* * *

نـــاخ بـوچــــــکرم زرمـولا
ممحیام ژێر چەکمه و سۆلا
نـمز بوومـــــه وەکـی هۆلا
چمرمی مـن بوو ومک زۆلا
تـــۆ مـمزنـــــــنبه بـۆ تۆلا
هـمر ومکـی به بـــری چۆلا
کوتـــــــکه سـمری زرمۆلا
نـمز گـریـــامه تۆ نەگـری
ممزنـــــــنبه بـۆ بـمرگـــری
تـــۆلا بـاڤـــــتی ڤەگـــری

## لای لایەیەکی دایکانی کورد ـ له ممریوان

دایکێکی کورد له ممریـوان لای لایـه بۆ کورپمکەی دمکات و نـزای نـــموه دەکـات که خــوا کورپـــمکەی لـــێنمسێنێت و نموەی له شـــێوەی کورپـمکەی نموی نییه خوا بیـداتێ. له نیوه دێـری شـــمشمم و حموتـــمم دا دەمــان هێنـنێته پێکـمنین:

هەرکەس هەسی لەم وێنە
خوا گیان تۆ لێی مەسێنە
هەرکەس نیەسی لەم وێنە
خوا گیان تۆ پێی بنوێنە
قوربانت بەم هەمیشە
گەردەن گوڵاوی شیشە
خوا بمکات بە تووتی
قەپێ بگرم لە لووتی
هەتوول هات و هەتوول چوو
هەتوول گوڵی عەمبەر بوو

<u>لای لایەکی دایکانی کورد ـ لە گەرمیان</u>

لای لایە رۆڵەم لای لایە
خۆزگە لای لایەی عالەم وا بوایە
من لە شیری خۆم نازادت دەکەم
بۆ نەتەوەی کورد پەروەردەت دەکەم
دەست و قاچت دەبەستم بە دەسرازەی بەن
بەشکەم نەترسی لە کۆت و پێوەن
لای لایە لای لایە کوڕم لای لایە
لە کزەی کوردان دەنگم دەرنایە

<u>لورینێکی دایکانی کورد ـ لە باکووری کوردستان</u>

زیاتر لە سەد ساڵە تورکیای رەگەزپەرست و فاشست کۆمەڵکوژی کورد دەکات، تا ئەمڕۆش لە لایەن هێزەکەی نەتەتورکی

رەگەزپەرست ئەردۆگانەوە، نامەردانەتر و درندانەتر هەوڵی سڕینەوەی ناسنامەی کورد دەدەن و دەیانەوێت زمانی کوردی کاڵ بکەنەوە و ژێرخانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و داب و نەریتی کوردیمان ریشەکێش بکەن. تەنانەت دەست لە منداڵی ناو لانک و بێشکەش ناپارێزن.. ڕێیان بە چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی کوردی نەداوە کە گەشەبکەن.. تا مێژووی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردیمان بنووسنەوە و بڵاوی بکەنەوە و بە ئەرشیف بکرێن، بەڵام بەشێکی ئەدەب و فۆلکلۆر و لای لایە و لوری کوردی بە زارەکی پارێزراون و لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی ترمان گوازراونەتەوە.. ئەمە لای لایەیەکی کرمانجییە بە ڕێنووسی ئەلفوبێی ئارامی کوردی:

لوری ، لوری ، لوری ، لوری
لوری لوری ، بەرخەلم لوری
لانەک لاری لانەکو ، نای لاوی مالی بەرخام لوری
وەزی باوێژمە سەرچاوی ، بەرخی قورسە وەی دەسمالی
لانەک لایی لایی
وەزی لانەکا بەرخا خوە ، هەلینمە کاولی گوندا
مالا خالی ، لانەک لاری
شەو یەدینی لانەکا بەرخام ، دایک کەتی ، بەرخی لوری
مەرە بەخی لە مال دەرینا سەبر کەتی
لانەک لایی لایی
وەزی لانەکا ، خەوی یادیمە کاولا ئەغەدیی
دە و مزگەوتی لانەک لاری
لو لو ، شیر ددەتی سەبرام لوری

## لای لایەکی دایکانی کورد ـ لە سلێمانی

سلێمانی شاری هەڵمەت و قوربانی.. قەڵای سەختی کوردایەتی.. پایتەختی رۆشنبیریی کوردستان.. شاری شاعیران و نووسەران و هونەرمەندان و رۆشنبیران و ناوداران. سلێمانی پایتەختی میرنشینی بابان و مەلیک مەحموودی نەمر. هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە تا ئەمڕۆ، مەڵبەندی رۆشنبیری و ئەدەب و هونەری کوردی بووە، زمانی کوردیمان لەم شارەوە گەشەی کرد.. بە دەیان شاعیر و نووسەر و هونەرمەند و رۆژنامەنووس و مێژوونووس و چیرۆکنووس و تێکۆشەر و کەسایەتی ناسراومان لەم شارەدا هەڵکەوتن.. لە ئەمڕۆش دا بە روخساری ئەم شارە جوانەی کوردستانەوە، لە هەموو بوار و رووێکەوە، مۆرکی رەسەنایەتی و سروشتی کوردی و کوردەواریی پێوە دیارە.. ئەمەش نموونەیەکە لە لای لایەی فۆلکلۆریی ناوچەی سلێمانی:

(سۆزی دایک)

هەرکێ کوڕم بانگ نەکا
خەڵە لە خەرمان نەکا
ساڵێ جاری نان نەکا
هەرکێ کوڕەکەم نەلاوێنێ
کەرێی بەهار نەتاوێنێ
کوڕی من زۆر نازیزە
لە رووم و نەجەم بەرێزە
لە بەردەمیایە کەنیزە
بۆیە بە دەعیە و فیزە

دکتۆرە نەسرین فەخری لە پەرتووکی (یاری) لەو پێنج نیوە دێڕەی سەرەوەدا (نە)ی بە نەرێنی نووسیوە، واتە لە جێی (نە)، (ب) ی نەرێنیی داناوە، بەم جۆرە:

هەرکێ کـوڕم بانگ بکا
خەلە لە خەرمان بکا
سالێ جاری نان بکا
هەرکێ کوڕم بلاوێنێ
کەرێی بەهار بتاوێنێ

لای لایەکی تری ناوچەی سلێمانی، دەقی ئەم لای لایەم لە پەرتووکی (لایلایەی دایکانی کورد، کۆکردنەوەی: هاشم سەلیمی و عوسمان محەممەد هەورامی) وەرگرتووە:

لای لایەت بۆ دەکەم بە زمانی کوردی
خەوت لێکەوێت بە کامەرانی
دە لای لایە کوڕەکەم لای لایە
یا خوا مەردانە بێیتە ناو کایە
شەوگاری درێژ هەر دەبڕێتەوە
باوکت لە سەفەر دەگەڕێتەوە
رۆڵەم لای لایە، دیدەم لای لایە
شەوگار درەنگە و ڕۆژی لە دوایە
یا خوا نەمری، نەچی بە داخەم

گرنەکەی سەیوان نەکەی بە باخــم
لای لایەت بۆ دەکەم بە زمانی کوردی
رۆڵەکەم بـژی و بمـری بە مـەردی
لای لایەت بۆ دەکەم بە دەم وەشتەوە
یا خوا نەمێنێت شـەو بە دەشـتەوە
لای لایەت بۆ دەکەم بە زمانە شیرین
چـاو بکەیتە خـەو دەم بە پێکەنین
لای لایە کۆرپـەکەم خەو بتبـاتەوە
فریشتەی سەر بەخێـر بێت بە لاتەوە
رۆڵـەم لای لایـە جگەرگۆشـەکەم
نـارامی دڵـەی پـڕ خرۆشـەکەم
رۆڵـە داری بێشکەکەت لە داری گوڵە
پێکەنینـەکەت نـارامی دڵە
رۆڵـە بێشـکەکەت لە دار خورمـایە
سەربێشـکەکەشت چیتی بەغـایە
خوا مورادم بـات ، باخـم بەرین بێت
کچـم شوو بکـات، کـوڕم ژن بێنێت
لای لایـە، رۆڵـەم لای لایـە
خەوی خـێرت بێت کۆرپـەلەی دایـە

## لای لایەیەکی دایکانی کورد ـ لە هەڵەبجە

بێگومـان مەرگەسـاتی شـاری هەڵەبـجەی شەهـید، بە کیمیابـارانی رژێمی شۆڤێنی عەرەبی کە لە بەعسی فاشستیدا بەرجەستە بـوو، لە بەرواری (١٦ی/ نـادار/١٩٨٨) بـرینێکی هـێندە قـووڵە، هەرگیز

سارێـژ نابێت، زامـاێکی هـێنده به سفـت و سوێیه، قەت خامـۆش نابێت، تـراژیدیـایەکی هێنده سامنـاکە، هەرهیز لە یادمان ناچـێتەوه.. تاوانێـکی پـڕاوپـڕ لە رقی رەش و لە رەگەزپەرستی و لە نـامەردییه. کە پێنـج هـەزار کورد شەهید بوون، کە لە (سەدا شـەست و هەشت) یـان منــداڵان و نافـرەتان بـوون، زیاتـریش لە دە هـەزار برینـدار بـوون، تـا ئەمڕۆش زۆربـەی بـرینـدارەکـان، برینەکـانیان سارێـژ نەبوونە و چارەسەری پێویستیان بۆ نەکـراون، تا ئەمڕۆش بەشێک لە منــداڵانی ونبـووی هەڵــەبجە نــەدۆزراونەتەوە. کۆمەڵکــوژیی هەڵـەبجە و "ئەنفــال"ی بەدنـاو هۆلۆکـۆستی کــوردن، پەڵـەیەکی قـێزەونی شـەرمەزاری و نـامەردی و بەدڕەوشـتیی تـا هەتـایین بە نێوچـەوانی شۆڤێنی عەرەبی و نەوەکانی خەلیفەکـانەوە.. لای لایـه بۆ هـەزاران منــداڵانی شەهـیدی هـەڵەبجـە، بـۆ هـەزاران پەپـوولەی خنـکاو، بـۆ هـەزار خونچـه نێـرگزی هەڵوەریـو.

ئەوەتــا دایکـێکی کـوردی هەڵەبجـەییمان، بـه دەمـی کۆرپەکـەیەوە، کـه وەڵامـی دایکـی دەداتەوە و دەڵێت دایـکه دەزانـی بۆ خەوم نـایە، چونکه کیمیا لـێیداوم، دەنگـم دەرنـایە:

رۆڵــــه لای لایـــه ، بـــاوکم لای لایـــه
خــوزگـه ئەمـــزانی بـۆ خـــەوت نـایـــه
* * *
دایــکه دەزانـــــــی بـۆ خـــــەوم نـایــــه
کیمـــیا لێــــیداوم، دەنـــــگم دەرنـایـــه
* * *
ماڵــێکت بـۆ بـکەم لـەو پـارچـه ئێـــمه

مالی شەهیدان، گول هەلدا خێمە

* * *

پچوو سلێمانە ، بۆم بێنە خەبەر
بزانم شەهیدان ، چییان هات وەسەر

* * *

بمری، بسووتی، گیانت دەربایە
دەنگی جوانانی هەلەبجە نایە

* * *

گردی شەهیدان، کەمێ بنوێ
لاشەی جوانتان، بەلکو دەرکەوێ

* * *

دەشتی شارەزوور دەچێنم بە گول
کوڕی شەهیدان، خەم نەگرن لە دل

* * *

بە نەرمە نەرمە، بە یاران یاران
بچینەوە هەلەبجە، دەستووری جاران

* * *

سەیری هەلەبجە، بەرزە دەماخە
یان سەیری گولە، یان سەیری باخە

* * *

بە نالە و کزە و کولی دلەکەم
ڕۆلە لای لایە بۆ نیوە دەکەم

## لۆری لۆری خلتوو گولسیڤین مەدار ـ باکووری کوردستان

کـــــورم نـەخۆشـــــە بـریـنـــــــداره
بـریـــــنی وی پـــــر خــــــــەداره
دایـــــکی رێبـین هۆسـتـێخـــاره
لـــــۆری لـــۆری لـــۆری لـــۆری
بـەرخــــــــــــــم لــــــــــۆری
لـــــۆری لـــۆری کـــــورم لـــۆری
دەرنت گـــــرانو دایـــــک گـــــۆری
دایــــکا فەقـــیر تی و بـەرچـــــیایە
وەرە هـەکیـــــمو چـــــاره چیـــیە
بـە شـــــەوان لـە چـــۆل و چـــــیایە
لـــــۆری لـــۆری لـــۆری لـــۆری
بـەرخــــــــــــم لـــــــــــۆری
لـــــۆری لـــۆری کـــــورم لـــۆری
دەرنت گـــــرانو دایـــــک لـــۆری
لـــــۆری لـــۆری لـــۆری لـــۆری
بـەرخــــــــــــم لـــــــــــۆری

## لاوە لاوەی دایکانی کورد ـ لە ئیلام

لاوە لاوەگـــــــــەم کـۆرپـــــــەگەم لاوە
دیــــــدەی ئـەزیـــــزم دەمــەس خــــاوە
دەرنت دە گــــــیانـم هــەر دە دوورەوە
قیـــافەت وە گـــرد زەرەی نـــوورەوە
لاوە لاوەگـــــەم دە کـــــوردە مــــــالان

ده رۆلـەم وە دوور گشت بەری تــاڵان
بــازوبــەن بـاڵــت نـەقیــق و لاڵــــە
باوگــت رووســـەمە باپــیرت زاڵــــە
یـــاران کـی دیـیە کــوڕ وە گـایـــاری
گــــاوەسن تــڵا گـــاڕان مـــرواری
ئــەو تەنیـــا دارە دو پـلچـەی دوورە
هەرکەس کـوڕ نەیری زەوقی دە کووە؟
گــەدایی شـــاران وە پـــێ واجـــووە

<u>لاوە لاوەیەکي دایکاني کورد ـ لە لورستان</u>

لاوە لاوەگـــــەم لـە پـــای گـــــاڤـارە
کوڕ وێنەی مانگ و دوویە چوو هسارە
لاوە لاوەگـــــەم لـە گـیـــــان و لــە دڵ
جـی راد خـسـەمـەو لـە پـــای دار گــوڵ
وە لاوە لاوە لاوانـــــــــــــــــە ســــــەد
وە قـسـیـەی شـیـرین خـەفـانـمە ســـەد
کەلەشـــیرەگـە بـوریـــــــەی دەنــــووکـد
کوڕەیەم خەو نیمەکەوی لە قوولە و نووکد
لاوە لاوەگـــــــەم لـە نـیـــــــوارەوە
زەری زەنـــگی تیـەی لـە گـافـــــارەوە
لاوە لاوەگـــــەم لـە وای نـیـــــــوارە
ئـەرا کـوڕیـــــگـەم هـــا لـە گـافـــــارە
رووڵـــە گـیـان بخـەف شـەوەکی دوورە

سوو تەول ژەنین و هەل هەلی سوورە
لاوە لاوەگەم لاوەێ نازاران
وە دەنگ نەرم و وە پەرزەی واران
لاوە لاوەگەم لاوەم شیرینە
کردم وە نەزر نو مال و مینە

## لای لایەیەکی تری دایکانی کورد ـ لە ئیلام

مالەیەل ئاودان ، وێژنگ وە کییە
کوڕپەکەم دگری نان نەرای نییە
شەکەر بکوتم وە نەباتەوە
نەڕا کوڕگەم دە شار هاتەوە
هەر کەس مزگانی کوڕەگەم باری
دە قەن شیرینتر دکەم وە باری
مال و مینەکەم تەولێ بسازم
لە نوای سووری سەما بوازم
گیانم دە گیانت ، گیانت بوو بەستە
وە زوور عەلی بنیما ناوک خەستە

## لای لایەی فەرزاد فەریدی بۆ ئاوارەکانی شاری کرماشان

لە رۆژهەلاتی کوردستان، لە رووداوی بوومەلەرزەکەی شاری کرماشان و لە شارۆچکە و دێیەکانی دەوروبەری، لە بەرواری (١٢/ ١١/٢٠١٧) دا زیاتر لە (٥٣٥) کورد گیانیان

لەدەست دان، بە هەزاران بریندار بوون، زیاتریش لە (٣٦) هەزار خانوو ویرانبوون و بە هەزاران کورد ئاوارە و سەرگەردان و بێ شوێن و لانە بوون.. بە سەدان کورد، بە هۆی سەرما و کەم خۆراکی و ئاوی پیسەوە، تووشی نەخۆشی بوون. ڕژێمی ڕەگەزپەرستی کۆماری ئیرانی سێدارە، وەکو پێویست بە دەنگیانەوە نەچوون و ئاوڕیان لێنەدانەوە.. بوومە لەرزە بەم شارە جوانەی کوردستان فێربووە و بەرۆکی بەرنادات.. چەند هونەرمەندێکی گۆرانیبێژی کوردمان لای لایە و هاوار و شینیان بۆ کرماشانی ویران وت، لەوانەش، فەرزاد فەریدی، نەوید زەردی، مەزهەری خالقی. ئەمەش بەشێکە لە لای لایەی هونەرمەند (فەرزاد فەریدی) بۆ کرماشان:

لای لای لای کرماشانەکەم
لای لای لای ماڵوێرانەکەم
لای لای لای کوردستانەکەم

* * *

ئەی کوردی هەژار
کوردی بێ چارە
بەدبەخت و بێ کار
دایەم ئاوارە
دەردی خەمی تۆ
یەک و دوان نییە
هەی خاوەن چوار
خودای بان سەر خۆ ئاوی هەیە
ئەویش زوڵمی کرد لە کوردی هەژار

* * *

لای لای لای کرماشانەکەم
لای لای لای مالوێرانەکەم
لای لای لای کوردستانەکەم

## لای لایە بۆ منداڵانی شەنگالی برینداڕ

ئێزیدییەکان کوردی ڕەسەن و بەشێکی دانەبڕاون لە نەتەوەی کورد، زێدیشیان بەشێکە لە کوردستان، بە زمانی کوردی، بە زاری کرمانجیی باکوور دەخافتن. ئاینی ئێزدی کۆنترین ئاینی کوردی و ڕۆژهەڵاتە و مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە چوار هەزار ساڵ بەر لە مێژووی زاینی. پەرتووکی پیرۆزشیان (مصحف رەش) بە زمانی (ئاڤێستا) کوردی نووسراوە.. کە زمانی فەرمیی ئیمپراتۆریەتی مادی بوو.

برایانی ئێزیدیمان بە درێژایی مێژوو، لە لایەن داگیرکەرانی کوردستان و توندڕەوانی ئاینی ئیسلامی و ڕەگەزپەرستانەوە (٧٤) جار، ڕووبەڕووی ستەم و چەوسانەوە و کۆمەڵکوژی و ماڵتاڵانی و وێرانکردن و داگیرکردنی خاکیان بوونەتەوە. لە ساڵی (١٠٧٠ز) دا، ژمارەی دانیشتوانی شەنگال (٣٠) هەزا کەس بووە، کە هەر هەموویان کوردی ئێزیدی بوون. لە ساڵی (١٣٩٤) دا، قەزای شەنگال (٣٥) هەزار خانوو بوو. لە لایەن لەشکرەکەی (تیموور لەنگ)ەوە هێرش کرایە سەر شەنگال و ماڵەکانیان تاڵانکردن و هەموو خانووەکانیشیان سوتاندن. لە ساڵی (١٥١٦) دا شەنگال بووە چەقێکی ملململانێ لە نێوان عوسمانییەکان و سەفەوییەکاندا، کە هەردوو لایان داگیرکەری

کوردستان بوون.. لە ساڵی (١٨٣١) دا، لە لایەن عوسمانییە خوێنڕێژ و ڕەگەزپەرستەکانەوە، شەنگال و دنیەکانیانی تاڵان کردن و سووتانیان و بە سەدان برای ئێزیدیشمانیان شەهید کردن. لە ساڵی (١٩٧٠) وە، لە لایەن ڕژێمی ڕەگەزپەرستی بەعسی عەرەبییەوە.. پرۆژەی بەعەرەبکردن لەم شارەدا دەستی پێکرد.. لەوەدواش بە زۆر خەڵکی شەنگالیان لە زێدی هەزاران ساڵەی باوباپیرانیان دەرکردن و لە نۆردوگا زۆرەملێکاندا، نیشتەجێیانیان کردن، ڕژێمی بەعس چەند گەرەکێکی تازەیان بۆ عەرەبە هاوردە توندڕەوەکان لە شەنگال دروست کرد.. زیاتر لە (١٥٠) گوندی شەنگال لە لایەن بەعسی شۆڤێنییەوە تاڵان کران و سووتێنران. لە ساڵی (١٩٨٠ ـ ٢٠٠٢) بە بیانووی ئەوەی کە ئێزیدییەکان ڕەتیان کردەوە کە ناسنامەی نەتەوەییان لە کوردەوە بۆ عەرەب بگۆڕن و نەشبوون بە جاش. بە لایەنگری پێشمەرگەش تاوانباریانیان کردن. سێیارە گوندەکانی شەنگال سووتێنران. بۆ گۆڕینی دیموگرافیای شەنگالیش عەرەبی هاوردەی زیاتریان بۆ شەنگال و بۆ گوندەکانی سەر بە شەنگالیان هێنان. حکومەتی ئێستای عێراقیش درێژە بە هەمان پرۆژەی گڵاوی بەعس دەدات و بە شێوەیەکی تۆکمەتر، درێژە بە سیاسەتی شۆڤێنی و ڕەگەزپەرستی و بە بەعەرەبکردنی قەزای شەنگال و نیەکانی دەدەن و داگیریان دەکەن.

مێژووی برایانی ئێزیدیمان تراژیدیایەکی پڕ لە کارەساتی بێ برانەوەیە، هەرجارەی لە فۆرمێکی جیاوازدا دووبارە دەبێتەوە.. لە سەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلامەوە، تا دەگاتە ژێمی بەعسی عەرەبیی شۆڤێنی و ڕەگەزپەرست و تا ڕێکخراوی تیرۆریستی داعشی جاشی بەکرێگیراو و چەتە و دڕندە و بێڕەوشت و

کۆنەپەرست و هـزر بـۆگەن، تـا حکـومەتی ئەمـڕۆی عـێراقیش، چەندین جـار ئێزیدییەکـان ژینۆسایـد کـران.. بـەڵام کۆڵـیان نەداوە و سووربوونـە لەسـەر کوردبـوونیان و داکۆکییـان لە بـڕوا و ئاینەکەیـان کـردووە و تـا ئەمـڕۆش لەسەر بەهـا و داب و نەریتـە ڕەسەنەکـانیان ماونـەتەوە.. لـەم پێناوەشـدا بـاج و قـوربانییـەکی زۆریـان داوە.

شەنگـال قـەزایەکی کوردسـتانییە، گەرچـی سـەر بە پارێـزگای مووسڵە.. هەر مووسڵیش شارێکی داگیرکـراوی کوردستانە.. ئەوەی نکـوولی لەم ڕاسـتییە دەکـات بـا بچـێت مـێژوو بخوێنـێتەوە.. ژمـارەی ئێـزیـدییەکـان لـە کوردسـتان و لـە عێراقـدا، نـزیکـەی (٩٠٠) هـەزار کەسـن، هەزاران سـاڵە کە لە قـەزای شەنگـال و شێخـان و ناوچـەکـانی دەور و بـەریـانـدا دەژین. زیـانیـان بـۆ هـیچ نەتـەوە و لایـەنێـک نەبـووە. ژمـارەیـەکی زۆری ئێزیـدیش لـە ڕووسـیا و جۆرجـیا و تورکـیا و ئـەرمینـیا و کـازاغستان و لـە وڵاتـانی ئـەورووپـادا دەژین. تێکڕا ژمارەیـان لـە ملیۆن و نیـوێک زیـاترن.

لە ڕۆژی (٣ی/ ئاوگوسـت/٢٠١٤) هـێزێکی گەورەی دڕنـدە بـێڕەوشت و نامەردەکـانی داعشی جلشـی بەکرێگـیراوی تورکیـا و قەتەر، لە تەلعەفەر و بەعاجەوە، هـێرشیان کـردە بـۆ قەزای شـەنگال و بۆ گوندەکانی دەوروبەری بـێ ئەوەی کە هیچ بەربەستێکی ئەمنـی و هیـچ هـێزێـک ڕێگـریـیان لێبکـات و ئێزیـدییەکان لـە کۆمەڵکـوژی بپارێـزێت.. بێگومـان داگیرکردنـی شـەنگال و دنیمکـانی ئێزیدییەکان و ژینۆسـایدکردن و بردنـی ژنـان و کچـانیان و تاڵانکـردن و وێرانکـردنی زێدیـان، پیلانێکی داڕێـژراوی پێشوەخت بـوو، نـەک

تەنیا داعش، تورکیا و قەتەریش لەم پیلانە قێزەوەن و بێ ڕەوشتییەدا، هاوپیلان بوون.

بەپێی ئامارە فەرمییەکان، زیاتر لە (٢٠٠٠) کوردی ئێزیدی لەم شاڵاوەی داعشدا، بە شێوەیەکی دڕندانە کوژران و سەریان بڕین و شەهیدکران. تەنیا لە گوندی (کوچو)ی جوان، لە باکووری شەنگال، نزیکەی (٨٠٠) لاو و پیاوی ئێزیدییان خلتانی خوێن کردن و شەهیدیانیان کردن. زیاتریش لە (٣٠٠٠) ژن و کچانی پاکیزەی کوردیان گرت و بردیانیان بۆ شاری مووسڵ و دواییش بۆ شاری ڕەقە لە سوریا، بە شێوەیەکی زۆر نامەردانە و ناڕەوشتییانە ڕەفتاریان لەگەڵدا کردن، وەکو کاڵایەکی بازرگانی و کۆیلەش سەودا و فرۆشتنیان پێوە کردن.. لەو ژمارە ژن و کچ و منداڵانە تەنها ژمارەیەکی کەمیان لەژێر دەستی داعش رزگاریان بوو، یا بە هەر شێوەیەک بێت رزگار کران. ئەو دوای تا ئەمڕۆش بێ سەر و سۆراغ و چارەنووس نادیارن.. زیاتر لە (٢٠٠) هەزار ئێزیدیش ملیان بە چیای شەنگالەوە نا. نزیکەی (٥٠٠) کەسیان لە تینوا و لە برسا و لە سەرما شەهید بوون.. گەریلاکانی پارتی کریکارانی کوردستان ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە کردنەوەی ڕێگای نێوان باشوور و رۆژئاوای کوردستان دا، بۆ رزگارکردن و دەربازکردنی خێزانە گیرخواردووەکانی سەر چیای شەنگال.. روویان لە رۆژئاوای کوردستان کرد. سەرجەم داعش (٥٠٠٠) کوردی ئێزیدییان شەهید کرد. (٥٠٠٠٠٠) ئێزدی ئاوارە بوون، لە کەمپەکاندا لە ژیانێکی زۆر سەختی جەستەیی و دەروونی دەژین، زۆر کەمیان گەڕاونەتەوە شەنگال.. داعش شەنگالیان وێران کرد. (٣٠) پیرۆزگاشیان وێران کردن. نزیکەی (١٠٠٠) منداڵ و

میردمنـدالی ئێزیـدیش، لە سەربازگەکـانی داعـشدا، شـۆرینی مێـشکیان بـۆ کـردوون، بە زۆر دەیـانکەن بە ئیـسلام. تا ئێستاش (٦٦) گۆڕی بە کۆمەڵی ئێزیدییەکان دۆزراوەتەوە.. کەلە لایەن داعشەوە دڕندانە و نامەردانە شەهیدیانیان کردن.. تا ئەمڕۆش یەک دەوڵەتی ئیسلامی و عەرەبی ئەم تـاوانە قێزەوەنـە نامـرۆییانەی داعشیان شەرمەزار و سەرکۆنە نەکرد؟؟

شەنگـال کارەساتێکی تـراژیدیـای هـێندە جەرگـبڕ و دڵ تەزێنە، برینێکـی هـێندە قـووڵ و بەسـۆیە، هەرگیـز سارێـژ نابێـت و لە بیرمـان ناچـێتە.. چیرۆکێکـی راستییە و بـۆ ئەوە لە دوای ئەوەمـانی دەگـێڕینەوە. رۆژی هەزار تـف و نەفـرەتیش لـە داعـش و لایەنگـیرانی داعـش دەکەیـن.. مـایەی شانازیـشە کە شـەرڤانانی قارەمـانی کوردسـتان، تـۆڵەی شـەنگال و کۆبـانی و کۆچـۆ و بە هـەزاران شەهیـدی کوردیـان لێکـردنەوە. کـردیانیـان بـە پەنـدی زەمـانە و بە سـەدانیان لـێ تۆپانـدن و رسوایانیـان کـردن. بە سەدانیشیان لێ بە دیل گرتن و سەریـان پـێ شۆڕکـردن.. مایـەی دڵخـۆشییە کــە بـە دەسـتی شەرڤانـانی قارەمـانی کوردەمـان نەفـسانەی داعـش کۆتـایی هـات.. هەمـوو جیهـان قـەرزاری کـوردن.

سەرکـردەی تێکۆشـەر و قارەمـان و سیاسـەتمەدار و شاعـیر و هونەرمەنـدی گەلەکەمـان (سـەلاحەدین دەمیرتـاش) هاوسـەرۆکی هەدەپە، لە مـانگی پووشـپەڕی سـاڵی (٢٠١٧) دا، لە بەنـدیخـانەی ئەدینەبرە لە ئەنقەرە، هۆنـراوەیەکی بـە ناونیشانی (منداڵە نـازاکانی شەنگـال) بە تـورکی نووسـی و لە چەنـد رۆژنـامەیەکی تورکیـدا بڵاوکـرایەوە.. دەمیرتـاش لە هۆنـراوەکەیـدا، دەڵێت: بـۆ رووحـی رەوانـی ئەو کەسـانەی کە بە شێوەیەکی دڕنـدانە لە لایـەن داعشەوە

شەهید کران، بۆ ئەو لاوانەش کە قوربانیان دا و قارەمانانە و گیان بەختانە، بەرگرییان لە شەنگال کرد و رووبەڕووی داعش بوونەوە.

ئەمەش دەقی لای لایەیەکی کوردییە لەژێر ناوی ( پێشکەشە بە مندالانی شەنگال) هۆنراوەی کاک (کاکۆ زەند) و ئاوازی (شەهرام محەممەدی) و رێکخستنی (ئاراس محەممەدی) و گۆرانیبێژ (شادی غولامی) تۆماری کردووە.. کاکۆ زەند هەر خۆی دەقی هۆنراوەکەی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی فارسی.. نەنووسراوە کە کاک کاکۆ زەند خۆی یان کەسێکی تر ئەم هۆنراوەیەی وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی. هەر کەسێک وەریگێڕابێت جوان وەری گێڕاوە.. بەلام کە دەقە کوردییەکەی و وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەم بەراوردکرد. ئەم چوار ئیوە دێڕە (سیانزە، چواردە، پانزە، شانزە) لە ئینگلیزییەکەدا هەن، بەلام لە دەقە کوردییەکەیەکە و لە فارسییەکەدا نین. نازانم بۆ؟ بۆیە من ئەو چوار ئیوە دێرەم لە ئینگلیزییەکەوە وەرم گێڕا بۆ کوردی.. بە داوای لێبووردنیشەوە، لە هۆنراوەکەی کاک کاکۆدا، لاوازی کوردیی پێوە دیارە، ناچار بووم کە کەمێک دەستکاریی وشە و رستەکانی بکەم.. وەرگێڕانی دەقە کوردییەکەش بۆ ئینگلیزی لە (یوتیوب) دا بلاوکراوەتەوە.. پێشم جوانە کە وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی لەم پەرتووکەدا بنووسمەوە. ئەمەش دەقی لای لایەکەی کاک کاکۆ زەندە:

هۆنراوە : کاکۆ زەند
ئاوازی : شەهرام محەممەدی

رێخستنی : ئاراس محەممەدی
گۆرانی ـ خلتوو: شادی غولامی

لای لایە لای لایە گوڵی ژاڵە، وشک نەبی لە بن ناوی
ئەگەر کانیی چیای شەنگال پەژارە تەڕ بکا چاوی

لای لایە لای لایە گوڵی فرمێسک ملی سووتان دونیایە
هەتا بتگرم لە ئامێزم وشک نەبێ سنگی دایە

لای لایە لای لایە گوڵی هێرۆ درەنگە هەستێ و بڕۆ
دایەت ماندووە، ئەو ڕێگایە لەبەر ئاچێ دەستی بگرە

لای لایە لای لایە گوڵی هیوا، دەزانم بۆچی دەڕوانی؟
سەرم سەرسامی شەنگالە و دڵم خویناوی کۆبانی

زمانم لاڵ بۆ بێدەنگی وا ئەکەی کە بە تەنیا
دایە بە جێ بێڵی لەم ڕۆژگارە ناکاوەدا

لای لایە لای لایە گوڵی تەنیا ئەوەندە فرمێسکی لێڕژا
دوو چاوانم کە نابینێ ئەو خاکەی کە تۆی تێیا نێژرا

هێشتا گەلێک لە خێزانەکە گەمارۆ دراون.. بۆ بۆ؟
بۆ ئێمە ناتوانین بگەین بە چارەسەرێک؟

هەموو خزمەکانمان لێرەدا چاوەڕێ دەکەن
ئێمە چیمان کردووە تا شایەنی ئەمە بین؟

لای لایە لای لایە بمجێت دێلم بە نامـانت گـولی من
نـاونیشـانی گـلکـۆکەی تـۆ لـووتـکەی چـیای شنـگـالـە

For Shangal Children

Composer: Shahram Almohamadi

Arrangement: Arash Mohamadi

Lyrics: Kako Zand

Singer: Shadi Gholami

La La La La ….. Ola ander flower

Will not dry – up

If Shangal Mountain springs

Wet its eyes with sorrow

If Shangal Mountain springs

Do not say this world is burned up

As long as I embrace you

Your mother,s breast will dry up

As long as I embrace you

Your mother,s breast will not dry up

La La La La… Hollyhock flower
It,s late , get up and walk
La La La La … Hollyhock flower
It,s late, get up and walk
Your mom is tired
Hold her hand
Your mom is tired
Hold her hand
La La La La … Hope flower
I know what you are looking at
My mind is disheveled with Shangal
My heart bleeding because of Kobani
La La La La ….
Why you are speechless o little flower?
La La La La….
Why you are speechless o little flower?
Do not leave your mom alone
In this sudden day
Do not leave your mom alone
In this sudden day

La La La La ….. Lonely flower,

Shower of tears do not let

My eyes see the land you are buried in

My eyes see the land you are buried in

Many in my family are still trapped there why, why?

Why can,t we reach a solution?

All my relatives are there, waiting.

What have we done to deserve this?

La La La La … I leave you

For a while my little flower

Shangal Mountain is the address of your grave

Shangal Mountain is the address of your grave

# گورگـانە شـەوێ

گـۆرانی (گـورگـانە شـەوێ) بەشـێکە لـە گۆرانییەکـانی دایکـانی کورد بـۆ کۆرپەکـانیان.

بە هەر هـۆیەکەوە بێـت، کە منـداڵی تەنـدروست خەوی زڕابێـت و نەنوێت. دایکی لە لای لایەکـردن و ڕازەنینی ماندووبێت و خـەوی بێت.. دایکی بۆ ترساندن و خەولـێکەوتنی، هـەڕەشە لە کۆرپـەکەی دەکـات و بۆ ترسانـدنی نـاوی ئـاژەڵێ دڕنـدە یا مـاڵی یا دەعـبای نەفسـانەیی دێنـێت و پێـی دەڵـێت:"ئەگـەر نەنـوێت: گـورگـەکە، پیـاوخـۆرەکە، سەگـەکە، پشیلەکە، حەپـەکە، مانگـاکە، کەڵەشـێرە، شومقـار،...هتد، بانـگ دەکەم بێت بلوورێنێت، بمـڕێنێت، بوەڕێـت، بمیاوێنێـت، بــزەڕێت، ببۆڕێنێـت، بقووقـێنێت، بقیژێنێـت، یـا بتگەزێت، چڕنووکت لێبدات، دەنووکت لێبدات،...هتد.

لەوانەیە هەنـدێ لە دایکان ئەوە نەزانن کە، کردنەخـەوی منـداڵان بە ترسەوە، کـارێکی هەڵە و نادروستە، دەشێ کاریگەرییەکی نەرێنـی و خـراپی دەروونی بۆ منداڵان هەبێت.

هەنـدێ جـاریش دایـک دڵـنیاییەک بە کۆرپـەکەی دەدات، بـۆ ئەوەی بەبـێ تـرس بنـوێت، ھەڕەشـە لە گورگەکـانی شـەوێ و لە پیـاوخۆرە زلەکـان و لە کەمتیـارە سـەپانەکان دەکـات، کە کـورپەکەی دەیەوێـت بنوێت و نایەوێـت گـوێی لە: لـوورە لـوور، مەرە مەڕ، حەپـە حەپ، میاوە میاو، زەڕە زەڕ، بۆڕە بۆڕ، قووقە قووقی ئێوە بێت، دەیەوێـت گـوێی لە لای لایەی دایـــکی بێـت.. دەی تـــا زووە لە ماڵەکـــەمان

دووربكەونەوە، نەگينا سزادەدرێن.. ئەم داوا و فەرمانەی دايكان لە شێوەی هۆنراوەی كێش و سەرواداری ئاسان و سووكدا وتراون يا دارێژراون و بە "گورگانە شەوێ" ناودەبرێن.. گورگانە شەوێ بەشێكی رەسەنە لە فۆلكلۆری كوردیمان.. ئەمەش سێ كۆپلەيە لە گورگانە شەوێی دايكانی كوردمان:

گورگانە شەوێ ، گورگانە شەوێ
بەرخە بچكۆلەم خەوی لێ بكەوێ
لە وورەی تۆی ناوێ لای لايەی دەوێ
دەڵێ لە ماڵی ئێمە دوور كەوێ

* * *

پياوخۆرە زلە پياوخۆرە زلە
كوڕيەكەم لەگەڵ دايكيا دەست لە ملە
مەری تۆی ناوێ هۆگری بولبولە
هيچت بە لوتەی نابێ لەم گەرد و خۆڵە
وە دووركەوە تا نەيانداويتە بەر گوللە

* * *

كەمتيارى سەپان ، كەمتيارى سەپان
رۆڵە شيرينەكەم نووستووە لە هەيوان
سپاردوومە بە پێغەمبەر و يەزدان
سپاردوومە بە ئايەتی قورئان
با حەيەی تۆ ببڕێ لە گوێمان

گورگـانە شـەوێ و تـرس خستە دڵـی منـداڵانی کورپـە بۆ نەوەی بنـوون، لە لای لایـەی زۆربەی گەلانی جیهانـدا هـەن. هەر گەلێکیش بەو بالـنــدە و نـــاژەڵە کێوییـــانە منـــداڵەکانیان دەترســـێنن، کە لە وڵاتەکـانیانـدا بوونیان هەیە.. بۆ نموونە ئـەم لای لایـەیە رووسـییە:

بنـوە ، بنـوە ، بنـوە
لە لێواری جێگـاکەت نـزیک مەبەرەوە
نەگینا بـانـگی گـورگە بـۆرەکە دەکـەم
دێت گـازت لـێدەگرێت

کاتێکیش کە منـداڵ مەستی خـەو دەبـێت و لـە خـەو هەڵـدەستـێت، دایـکی بــە رووبـەکی خــۆش و گەشــەوە، بــە زەردەخەنــەیەکی ناسکەوە، دەڵێت :"یاخـوا بەخێـر هەستێت" سەرچاوکەکەی لادەدات و دەسرازەکەی شل دەکاتەوە و سێ و چوار ماچی قووڵی دەکـات و بـە گـۆرانیـیەوە لە نێـو لانـکەکەی دەری دەکـات.. بـۆ نمــوونە ئەم دێـرانەی بۆ دەڵێت:

نـاخـــچی و بـوغـــــچـی
دایـە و بـاوە سنووقـــچـی
* * *
قـەزات لـە مـن و لەوانـە
شـــەوان دەچـنەوە کولانـە
بـە رۆژ دەچــنە دەرگـانـە
* * *
قـەزات لە مـــاڵ و مــەڕێ
مەڕەکە لە دەورت گــەڕێ

* * *

قــەزات لە مــاڵــی گــۆڕێ
کوڕەکەم هەرگیز نەتــۆڕێ

* * *

کوڕپەکەم هەستا لە خەوێ
گۆشــتی کەڵەبــــابی دەوێ

یان:

کوڕپەکەم هەســتا لە خەوێ
گۆشتی عەلەشیشی دەوێ

# هەڵپەڕاندنی منداڵان

هەڵپەڕاندنی منداڵان بە گۆرانی وتنەوە لە لایەن دایکانیانەوە، سوودێکی جەستەیی و دەروونی هەیە و خۆشی و شادی بە منداڵان دەبەخشێت و پەیوەندیی نێوان دایکان و کۆرپەکانیان بەهێزتر دەکات.. دایکانی دیواندەریی و سنەیی بەم دێڕە هۆنراوانە کۆرپەکانیان هەڵدەپەڕێنن و دەڵێن:

خەپە نان و خەپە دۆ
خەپە پلاوی عەنبەربۆ
کش کش کش وە باڵای تۆ
تۆپی زەری کەوای تۆ
نینی نینی نیگەڵە
کورەکەم فێری باخەڵە
ڕۆن و هەنگوین تێکەڵە
قەزات لە گیانم کەفتۆ
شەو لە باخەڵا خەفتۆ

دایک هەر بۆ خۆشی و بۆ گورجوگۆڵکردن و بۆ سەرنج ڕاکێشانی کۆرپەکەی بە لای خۆیدا، ئەم گۆرانییە فۆلکلۆرییە کوردییە باوە، بۆ کۆرە کۆرپەکەی دەڵێت:

دەرنت کەفتێیە لە هازم

هەفت ژن ئەمراد بخوازم
یەکی بەگلەر بەگی بوو
یەکی هوومای پەری بوو
یەکی دزی لە گوێشی
یەکی مانگا بدووشی
یەکی نازار باوان
یەکی کوورپە لە دلوان
یەکی چەرمێ دەس ئەولس
یەکی کوور پەتک رس

هەر ئەم هۆنراوەیە بە کەمێک جیاوازییەوە، بە چەند دیالێکتی تری کوردی وتراوە.. بە (دیالێکتی کرمانجی باشوور) بەم شێوەیە:

خودا بدەی نیازم
حەوت ژنت بۆ دەخوازم
یەکی رەشی بەر کۆلین
یەکی تیسکە هەڵخلین
یەکی بۆ ماچ و مووچی
یەکی بۆرنگەی کووچی
یەکی بۆ سەر سەماوەر
یەکی پشت لە میوان کەر
یەکێکیش هەرا و هۆکەر

هەر هەمان گۆرانی دایکانی کورد بۆ کورە کورپەکانیان، بەم جۆرەش دەیڵێنەوە:

ڕۆڵە بژیم بمێنم
حەوت ژنانت بۆ دێنم
یەکیان تورکی تەماشا
یەکیان کچی پاشا
یەکیان نەرمی نێو نوێنی
یەکیان نان بتەپێنی
یەکێ ناوت بۆ بێنی
یەکێ چێشتت بۆ لێنێ
یەکێ مەشکە بژێنی

کاتێکیش کە دایک مەمک بە کورپەکەی دەدات و هانی شیرخواردنی دەدات، دەڵێت:

خەپڵە خەپانی گەردگە
دەم لە مەمانی گەردگە
خەپڵە خەپانی خۆمانە
نیمەی وە دەس بێگانە

بەشێک لە گۆرانییەکانی دایکان، لە تایبەتمەندی و لە خەون و نەندێشەی و لە جیهانی سادەی منداڵانەوە دوورن، بەڵام دایکانی کوردمان دانیانە و بە پێکانی دوو نامانج کورپەکانیان پێیان لاوندوونەتەوە و کردوویانیانەتە خەو. لایەکی تریشەوە کوڵ و

نازارەکانی ناخیشیان هەڵبرشتوون. گەرچی منداڵان لە واتا و لە مەبەستی لای لایەکان تێ ناگەن، بەڵام چێژ و خۆشی لە ئاواز و لە سەدای دایکانیان وەردەگرن.. ئەمەش نموونەیەکە لەم گۆرانییانەی دایکانی کوردمان بۆ کردنە خەوی کچە کۆرپەکانیان:

بە کەس کەسانی نادەم
بە کەس کەسانی نادەم
لە کەس کەسانم کەسێ
لە ناو پارچان نەتڵەسێ
بە پیاوی پیری نادەم
بە رێگای دووری نادەم
نایدەم بە کوڕە خەیاتێ
دەیبا دوورە وڵاتێ
نایدەم بە خانی بەجیا
ماڵی زۆرە و زووی دەبا
دەیدەم بە حەمە خۆلێ
بیکا بە دەستە گوڵێ
بی نێتە بانی دڵێ

کاتێکیش منداڵان گاگۆڵکێ دەکەن و سەرپێ دەکەون و دەکەونە پێ‌ڕەوەکە، ئەمە مایەی خۆشییەکی زۆرە بۆ دایکان و باوکان.. هەردوو دەستیان دەگرن و یارمەتیی رۆیشتنیان دەدەن و گۆرانییان بۆ دەڵێن، وەکوو:

داره دار، داره، داره
لاره لار، لاره ، لاره

کۆرپەکـــــەم .. داره .. داره
زووپـێ بـــگره .. بەهـــــاره
* * *
کۆرپەکـــــەم .. داره .. داره
کـوڕەکـەم دانـەی هەنـــاره
خـوا گیـان کوڕەکەم هـەژاره
هـەر خـۆت نیـگای بــــداره
* * *
یـان:
تـــاتـی .. تـــاتـی .. تـــاتـی
یـاخـــوا بەخـــێر هـــاتـی

دایکێکی کوردی کەڵهوریش، بەم شێوەیە گوزارشت لە پێ گـرتنی منـداڵەکەی دەکات:

لاوه لاوەکـــەم کـوڕەم پـــابگرێ
لە ماڵ خاڵۆ یەک یەک لا بگرێ

# گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندنی منداڵان

گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندنی منداڵان، کە لە کوردەواریدا بە "نەش نەش" ناودەبرێت. بەشێکی ترە لە گۆرانییەکانی دایکان بۆ کۆرپە جگەرگۆشەکانیان..گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن ئەو گۆرانییانەن کە دایکان یا داپیرەکان یا خوشکان یا هەر نافرەتێکی تر، مەگەل هەڵپەڕاندن و ختووکەدان و یاری کردن لەگەڵ منداڵەکانیاندا، بە دەنگێکی ناسک و بە ئاوازێکی شیرین و بە رتمێکی خێرا و بە زەردەخەنە و بە رووییەکی گەشەوە بۆ منداڵەکانیان دەیڵێن. ئەم گۆرانیانە بۆ منداڵانی یەک تا دوو ساڵان دەوترێن. مەبەستیش لەم گۆرانییانە، خافڵاندن و ژیرکردنەوە و خۆشی و شادی بەخشینە بە منداڵەکانیان.. دایکان بزانن یا نەزانن، ئەم گۆرانییانە سوودی جەستەیی و دەروونییان بۆ منداڵەکانیان هەیە.. منداڵەکانیان ئەو هەستە دەروونییەیان لا دروست دەبێت، کە دایکانیان خۆشیان دەوێن و گرنگییان پێدەدەن.. گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن بریتین لە چەند دێرێک یا چەند کۆپلەیەکی کێش و سەرواداری سووک و ناسان و رەوان. بە بەشێکیش لە فۆلکلۆری کوردی دەزانرێت.

گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن گەرچی سادە و ساکار و وشە ناسانن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر وەکوو پاکیی منداڵان واتای جوان و سوود و ئامانجی پەروەردەییان لە خۆگرتوون.

منداڵان چاو لە دایکانیان دەکەن و فێری وشە و قسە و جووڵە و رۆیشتن و دەبن.

دایکان لە گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندندا، هیوای خۆشی و شادی و بەختەوەری و داهاتوویەکی گەش و پلەیەکی باڵا بۆ کورپەکانیان دەخوازن، یان بە شان و باڵیاندا هەڵدەدەن و شانازییان پێوەدەکەن.. خوازیاریشن مرازیان بێتەدی و منداڵەکانیان گەورەبین و ژنیان بۆ بهێنن، یا بیاندەن بە شوو. گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن چەند جۆرێکن، هەیە بۆ کوڕان، هەشیانە تایبەت بە کچانن، هەشیان بۆ کوڕان و کچانن.

لە ئەمڕۆدا، بەشێکی زۆری گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندنی منداڵان لە بیرچوونەتەوە، زۆر کەمیان ماونەتەوە.. بۆ ئەوەی ئەم ماوانەش لە بیر نەچنەوە، پێویستە بە دەنگی دایکان تۆماربکرێن و بە ئەرشیف بکرێن.

بەهای راستی و چێژ و شیرینی ئەم گۆرانییانە، لە دەنگی پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی دایکاندا دەردەکەون، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە لە ناخی دەروونی دایکانەوە هەڵقوڵاون. چەند نموونەیەک لە گۆرانییەکانی دایکانی کورد، لەگەڵ هەڵپەڕاندنی منداڵەکانیان:

دایکێکی کورد لە کرماشان، بەم چەشنە کورپەکەی هەڵدەپەڕێنێت و دەڵێت:

هەڵپەڕ، هەڵپەڕ وە خنجۆ
وە بار کۆڵی برێنجۆ
هەڵپەڕ هەڵپەڕ هەراتی
وە کورە چیتۆ دیر هاتی
هەڵپەڕ هەڵپەڕ پڕ وە نازو
وە بار پونە و پیازو

دایکانی کورد، لە دیواندەرە و لە سنەش، کچە کورپەکانیان هەڵدەپەرینن و پێیاندا هەڵدەدەن و ئەم گۆرانییەیان بۆ دەڵێن:

قەزات لە گیانم کەفتۆ
شەو لە باخەڵا خەفتۆ

* * *

ئا وەرەوە بزانم
کورە ناوت نازانم
نازیز قەزات لە گیانم

* * *

خش خش خش خشەپیلانە
کچمان خەڵکی گێلانە

* * *

وەی وەی وەی وەی بەرزیزە
کچمان خەڵکی تەوریزە

* * *

زۆر جوان و نیسک سووکە
کچمان خەڵکی کەرکووکە

* * *

بەهـ بەهـ بەهـ بەهـ چ جوانە
کچمان خەڵکی تارانە

* * *

چ جوان و ورد و مەردە
کچمان زۆر جوانە کوردە

دایکێکی تری کورد لە ئیلام لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە لە سەردەمی حوکمڕانی کەریم خانی زەندی کورد دا ژیاوە، سوپاسی خودا دەکات کە کچی پێداوە، دەڵێت:

خودا شوکر لەی هەنە
دەور کەریم زەنە
خودا کۆرپەی دا نەنە
خالق لێیمی مەسەنە
خودا شوکر مەنەتێ
کۆرپە بووە وە دۆتێ

دایکێکی کوردی ترمان لە کرماشان، بەسەر بە جوانیی کچە کۆرپەکەیدا هەڵدەدات:

لاوە لاوەگەم نەرای یەی تەلفێ
شەماڵ بشانوو زنجیرەی زلفێ
دوەتەم خەفتگە چو خەرمانەی گوڵ
پەنجەی شەمشاڵی ناسە بان دڵ
دوەتەم خەفتگە چو خەرمانەی بەێ
پەنجەی شەمشاڵی ها لە سەر سینەێ

دایکێکی تری کورد لە کەلهوڕ داوا لە ماڵان دەکات، کە کامڵی کوڕەکەم دەکات بە زاوای خۆیان. ئینجا بە شانی کوڕەکەیدا

هەڵدەدات کە راوکەرێکی شارەزایە و کەڵە ئاسکێکی کوشتووە، بێژنگ بێنن و بەشە گۆشتی خۆتان بەرن.. کورەکەشی بە کوڕی ناو کوڕان دەزانێت.. دەڵێت:

ماڵ یەڵەگە ماڵتان ئاوا
کامتان کوڕەکەم کرینە زاوا

* * *

ماڵ یەڵەگە وەر و پۆشت
وێژنگ بارن ئەرای گۆشت
تەنیا کوڕم کەڵی کوشت

* * *

کوڕم کوڕی کوڕانە
هەسەڵ لە دار بڕانە
ئۆیەت وە فێکە چڕانە

نموونەیەکی تری گۆرانی دایکانی کورد بۆ هەڵپەڕاندنی کچە کۆرپەکانیان:

ئۆخەی ئۆخەی ئۆخەیلی
مەجنوونە ئۆستی لەیلی
رێحانەی رووی دەر ناوی
دنیام بەبێ تۆ ناوێ
رێحانەی دەستە چنی
میوانی شۆرە ژنی

نینی نینی نینەڵە
هەنگوین و ڕۆن تێکەڵە
نینای نیناوێ
دەیننیم لە ناو کەژاوێ
بۆ کوڕی حاکمی ڕۆژاوێ

# بەڵێنەکانی دایکان بە کۆرپەکانیان

زۆربەی دایکانی جیهان، لەگەڵ لای لایە و گۆرانییەکانی هەڵپەراندنی منداڵەکانیان، بەڵێن بە کۆرپەکانیان دەدەن، گەر بنوون دیارییان پێشکەش دەکەن، یا ئەو مژدەیەیان دەدەنێ باوکیان لە ڕاوە یا لە کارە کە بگەڕێتەوە دیاریی خۆش و جوانیان بۆ دەهێنێ.

دەشێ دایکان لە ناو هێنانی باوکانی منداڵەکانیاندا، گوزارشت لە خۆشیی خۆیان بکەن بە گەڕانەوەی هاوسەرەکانیان بۆ ماڵەوە.. ئەگینا منداڵانی کۆرپە هێشتا زمان نازانن و لە بەڵێنەکانی دایکانیان و لە دیاری تێناگەن و نازانن چین.. بەڵام بەڵێنەکانی دایکان بێ واتا و بێ مەبەست نین. بەپێی دایکان و وڵاتانیش دیارییەکان جیاوازن.

<u>چەند نموونەیەک لەو بەڵێنانەی کە دایکان بە کۆرپەکانیانی دەدەن:</u>

دایکێکی ئینگلیزی ئەو بەڵێنە بە کۆرپەکەی دەدات، کە بە کەوڵێکی کەرویشک دای دەپۆشێت، کە باوکی چووە بۆ ڕاو و ڕاوی دەکات، وەکوو لەم گۆرانییەدا دەڵێت:

کۆرپەکەم ئەی چۆلەکەکەم
باوکت چووەوە بۆ ڕاو

## کەولی کەروێشکێکی دەست بکەوێت
## بۆ ئەوەی کورپەکەی پێ بپۆشێت

دایکێکی دانیمارکی ئەو بەڵێنە بە کورپەکەی دەدات، باوکی چووە بۆ (لونگبریگە) بۆ ئەوەی پێڵاوی تازە بۆ کورپەکەی بکڕێت، کە زۆر جوان و بریسکەداربێت.

(لونگبریگە: ناوی پردێکە لە (کۆپنهاگن)ی پایتەختی دانیمارک. هەروەها ناوی ناوچەیەکیشە لە ستۆکهۆلم ـ لە سوید) باوکت چووە بۆ لونگبریگە بۆ کورپەکەی پێڵاوی تازە بکڕێت

دایکێکی فەرەنسیش ئەوە بە منداڵەکەی دەڵێت ، کە مریشکە سپییەکە لەسەر لقی دارەکەدا هەڵنیشتووە، هێلکەیەکی بۆ دەکات.

دایکێکی چینی ئەو بەڵێنە بە کورپەکەی دەدات، کە باوکی بلویرێکی بۆ دێنێت کە لە داری (بامبۆ) دروست کراوە، بۆ ئەوەی فووی تێ بکات و یاریی پێ بکات.

دایکێکی ئەمریکیش لە شێوە چیرۆکێکی کورت و ئاسان و خۆشدا، زنجیرە بەڵێن و ئەگەرێک بە کورپەکەی دەدات، وا گۆرانیی بۆ دەڵێت.. وا دیارە باوکی لە لایەتی:

وسبه منداڵه بچکوڵەکه، هیچ وشەیەک نەڵێیت
دایکت چووه باڵندەیەکی خوێنەرت بۆ بکڕێت
گەر باڵندە خوێنەرەکە نەخوێنێت
دایکت دەچێت مستیلەیەکی ئەڵماست بۆ دەکڕێت
گەر مستیلەکە ئەڵماسەکە بشکێت
دایکت دەچێت چاویلکەیەکی بینینت بۆ دەکڕێت
گەر چاویلکەی بینینەکەت بشکێت،
دایکت دەچێت کارژۆڵەیەکت بۆ دەکڕێت
گەر کارژۆڵەکەت قوچ بدات
دایکت دەچێت گالیسکە و گات بۆ دەکڕێت
گەر گالیسکە و گایەکە وەربگەڕێن
دایکت دەچێت سەگێکت بۆ دەکڕێت کە ناوی رۆڤەرە
گەر ئەو سەگەی کە ناوی رۆڤەرە نەوەڕێت
دایکت دەچێت گالیسکە و ئەسپت بۆ دەکڕێت
گەر گالیسکە و ئەسپەکە بکەون
تۆ هەر جوانترین منداڵی بچکۆلەی لە شاردا
وسبه منداڵه بچکوڵەکه، هیچ وشەیەک نەڵێیت
دایکت چووه باڵندەیەکی خوێنەرت بۆ بکڕێت

لە کیشوەری ئەفریکاش، لە وڵاتی (کۆنگۆ) دایک ئەو بەڵێنە بە کۆرپەکەی دەدات، کە باوکی بەم زووانە دێتەوە و مراوییەک لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت بۆی دەکوڵێنێت و بیخوات:

يــو يــو يــو يــو يــو
لای لایـــــه لای لایـــــه
خۆشـــــەویستەکەم مـەگری
بـەم نـزیکـانە بابــە دێتـەوە
مراوییەکت بۆ دێنێت بیخـۆیت
لای لایـــــه لای لایـــــه

دایکـانی عـەرەبیش (نـوردنی، فەلەستـینی) بەڵێـنی ناڕاسـتی بـە کـوڕەکـانیان دەدەن، ئەگەر بنـوون، کـۆتـریـان بـۆ سەردەبـڕن:

بنـوە کـوڕەکـــــــــەم بنـوە
باڵندەیەکی کۆترت بۆ سەردەبڕم
کـۆتـــــــرەکە مەترســـــێ
بە منـداکــــــەم پێـــــدەکەم
بـۆ نــــــەوەی کـە بنــــــوێ

بەڵام دایکێکی عـەرەبی (سـووری) هـەر نـەم بەڵێن و کۆپلـەیە بـەم شـێوەیە دەڵێت:

بنــوە کــوڕەکــــــــــەم بنــوە
جــووتێ کۆتــرت بـۆ سەردەبـڕم
نـەی کـۆتـــــر بــڕوا مەکــــــە
درۆ لەگـەڵ کوڕەکـەم دەکـــەم
بـۆ نــــــەوەی کـە بنــــــوێ

# نموونە لە لای لایەی
# دایکانی گەلانی جیهان

کاتێک کە ویستم وەکوو نموونە ئاماژە بە لای لایە و گۆرانیەکانی دایکانی گەلانی تری جیهان بدەم و لەم پەرتووەکەدا بیان نووسم، چوومە نێو دەریایەکی قوول و جیهانێکی بەرینی لای لایە و گۆرانییەکانی دایکانیان بۆ خەواندنی کورپەکانیان.. هەر گەلێک بە دەیان و بە سەدان لای لایەیان هەیە و بە دەیان پەرتووکیشیان لەسەر لای لایە و گۆرانییەکانی دایکانیان بۆ منداڵان چاپکردوون. کە مێژووی هەندێکیان بۆ پێنج سەد ساڵ پێش ئەمڕۆ دەگەڕێنەوە. هەندێک لە لای لایەکان، سیما و مۆرک و تایبەتمەندیی ئەو گەلانەیان پێوە دیارن کە دایان ناون.. بەشێکیش لە لای لایەکان گلۆبالیزمین و تێکستەکانیان زۆر لە یەکەوە نزیکن. کۆمەڵێک لای لایەش هەن، هەر هەمان دەقن یا بە کەمێک جیاوازییەوە، هەر گەلێکیش بە تێکستی خۆی دەزانێت.. من پێم وایە کە ئەم نزیکی و لێکچوونەی لای لایەکانی دایکانی گەلان، بۆ ئەوە بگەڕێنەوە کە هەموو دایکان لە هەر شوێنێکی جیهاندا بن.. لە هەر نەتەوەیەکدا بن، خاوەنی هەمان سۆز و پەرۆش و خۆشەویستی و میهرەبانین.. منداڵانیش لە هەموو جیهاندا، هەر منداڵن و لەبەر دڵانن و جیاوازییان نییە.. وەکوو تێبینیش دەکرێت، کە زۆربەی لای لایەکانی دایکانی گەلان، بە دایکانی کوردیشەوە، ساکار و ئاسان و کورتن، بە زۆری بە فەرمانی داخوازی (بنوە، کۆرپەکەم، بنوە) دەست پێدەکەن.

بە سەدان لای لایەوووس و ئاوازدانەر و موزیکژەن و گۆرانیبێژی ناسراوی جیهانیش لای لایەیان بۆ منداڵان نووسیون و ئاوازدانەر ئاوازی بۆ داناون و موزیکژەنانیش موزیکیان بۆ ژەندوون و گۆرانیبێژانیش بە دەنگێکی خۆش چڕیویانن. بەڵام ئەمە راستییەکی هاشا هەڵنەگرە و کەسیش نکووڵی لێناکات، کە لای لایە بە دەنگ و سەدای پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی سروشتی و رەمەکی دایکان، کە لە ناخی دڵیانەوە هەڵدەقوڵێن، زۆر ناسکتر و شیرنتر و رەسەنترن.. هەر لە بنەڕەتیشەوە سەرچاوی کانیاوی لای لایە و لورین لە دڵی دایکاندا بووە.

ئەگەرچی ئێمەی کورد، خاوەنی دەسەڵات و دەوڵەتێکی سەربەخۆ نین و کوردستانی نیشتمانی شیرینمان داگیرکراوە و بەری ئازادییان لێگرتووین.. بەڵام بەراورد بە نەو گەلانەی بەختەوەرن و چەندین ساڵە خاوەنی دەسەڵات و سامان و دەوڵەتی خۆیانن، بێ زیادەڕۆیی، لای لایە و گۆرانییەکانی خەواندن و هەڵپەڕاندن و گورگانە شەوییی دایکانی کوردمان، لە ئاستێکی باڵادان.. کورد لە لای لایەدا زۆر دەوڵەمەندە. شایەنی نەوەین، کەلە ریزبەندیی هەرە پێشەوەی لایی لایە و گۆرانییەکانی جیهانی بۆ منداڵان ریزبەند بکرێین.. هیواخوازی ئەوەشم کە کەسانی دڵسۆزی زمانەوانی شارەزامان لە زمانی ئینگلیزیدا، گولبژێرێک لە لای لایەکان و لە گورگانە شەوییەکانی دایکانی کوردمان وەربگێڕن بۆ زمانی ئینگلیزی، تا گەلانی تر ئاستی لای لایەی کوردی بزانن.

هەندێ لە لای لایە و لورین و لە گورگانە شەوی و گۆرانییەکانی هەڵپەڕاندن و ژیرکردنەوە و پیاهەڵدان و

خوێندنی منداڵان، لە شێوەی کورتە چیرۆکە هۆنراوەدا ڕیزبەندی کراون.

تەنها بۆ ناساندن، چەند نموونەیەکمان لە لای لایە و لە گۆرانییەکانی دایکانی چەند گەلێکی جیهان بۆ خوێندنی کۆرپەکانیان بۆم گوڵبژێر کردن، کە زۆربەیانم لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرم گێڕاون بۆ کوردی، هەندێکیشیان لە نەرویجییەوە وەرم گێڕاون.

لای لایەکی ئەمریکی:

بنوە خۆشەویستەکەم بنوە
بنوە و بحەسێوە
باڵندەکان لە هێلانەکانیاندا نووستوون
کێڵگە و بێستان ئارامن
هەنگیش بە دەوری گوڵدا ناخولێتەوە
ئەوەتا تریفەی مانگ لە پەنجەرەکەوە دێت
گوێ بگرە لەوێ هیچ دەنگێک نایات
هیچ شتێکیش لە ماڵدا نابزوێت
مشکە بچکۆلەکانیش دوورن
سەرت بکە سەر سینگم
کۆرپەکەم بنوە و بحەسێوە

لای لایەکی نەرویجی:

کۆرپەکەم بە ئارامی بنوە
دایکت گلۆڵە شینەکە بادەدات
باوکت شەنەبای گەنمەکە دەکات

براكەشت شوانە و مەڕ دەلەوەڕێنێت
لە دوور دووری نـــــەو گـــــــــردە

## لای لایەیەکی تری دایکێکی ئەرویجی:

لای لایـــە، کوڕپـــــەکەم، لای لایـــە
مەنجەڵەکە وا لەسەر ئاگرەکە دایـە
بـۆ کـوڕپـە شـیـریـن و جوانـــەکەم
شـۆربـــای بـرنـــج بەشـــــیـر دەکەم
باوکت دانیشتووە و گەنم پاک دەکات
دایکت بلوێزێکی زۆر جوان لێدەدات
دادەت دانـیشـتووە زێـــڕ دەچـــنێت
کاکت چـــــووە بـۆ دارســــــــتانەکە
هـەر ئـاژەڵێکی کـێـوی راوبــــکات
گەر سپی بێت با بهێنێت بـۆ ئـێرە
ئـەوە مـەڕ یـا بـــزن یـا ئـاســـکەیە
گـەر بـۆرێـــکـی خـۆڵـەمێشی بێـت
ئەوە گورگە، لێی بگەڕێت بـا بـڕوات
گـەر دەوری سـیـنگی قـاوەیی بێـت
ورچـە بـا بە دارسـتانـەکەدا بـڕوات
لای لایـە، کـوڕپــــــەکەم، لای لایـە

## لای لایەیەکی ئەڵـمانی:

بنـــــوە کۆرپـــــــەکەم بنـــــــوە
باوکـــــــت مـــــــەر دەلەوەڕێنێـــــــت
دایکیـــشت داری خەونـــــی نیـــشتمان ڕادەوەشێنێـــــیت
بـــۆ ئـــەوەی خۆشترێـــن خـــەونت بـــۆ بەربێـــتەوە
بنـــــوە کۆرپـــــــەکەم بنـــــــوە
بنـــــوە کۆرپـــــــەکەم بنـــــــوە
کونجەکەمـــــان لـــە دۆلـــــێکی قـــوول دایـــــە
چـــــرا بچووکەکەمـــــان لەســـەر گـــیایەکەیـــــە
لەســـــەر خـــــوریی بەفرینــــدا کە زۆر نەرم و پاکــــــە
بنـــــوە کۆرپـــــــەکەم بنـــــــوە
بنـوە کۆرپـەکەم بنـوە

<u>لای لایەکی تری ئەلمانی:</u>

لای لایــــە .. لای لایـــــە
وسبە کۆرپـەکەم نەگری
لە لانک دایت و ڕادەژێنم
تا بنویت و بە نەرمی گۆرانیت بۆ بڵێم
لای لایــــە .. لای لایـــــە

<u>لای لایەی ئینگلیزی (شەو شاد):</u>

کـاتی ئـەوەیە کە بڵێیت شـــەو شـاد
شـەو شـــاد، خەوێـــــکی خــۆش
ئێستا ڕۆژیش ڕووناکییەکەی پێچایەوە
شـەو شـــاد، خەوێـــــکی خــۆش

خەونێکی خۆشی خەونەکان بۆ من
خەونێکی خۆشی خەونەکان بۆ تۆ
* * *
چاوەکانت لێکنێن و منیش لێکی دەنێم
ئەو شادە، خەونێکی خۆش
وا مانگیش دەرەوشێتەوە
ئەو شادە، خەونێکی خۆش
خەونێکی خۆشی خەونەکان بۆ من
خەونێکی خۆشی خەونەکان بۆ تۆ

لای لایەیەکی تری ئینگلیزی:

(ئەستێرە بچکۆلەکە) مێژووی ئەم گۆرانییە بۆ ساڵی (١٧٦١ز) دەگەڕێتەوە.

بدرەوشێوە، بدرەوشێوە، ئەستێرە بچکۆلەکە
من چۆن بزانم کە تۆ چۆنی
زۆر لە بەرزیدایت لە جیهاندا
وەکو ئەڵماس لە ئاسماندا
بدرەوشێوە، بدرەوشێوە، ئەستێرە بچکۆلەکە
من چۆن بزانم کە تۆ چۆنی
* * *
کاتێک کە خۆری گەرم ئاوادەبێت
کاتێک کە هیچ شەوقێک نەبێت
ڕووناکیی گەزی تۆ دەردەکەوێت

هەموو شەوێک بدرەوشێوە، بدرەوشێوە
بدرەوشێوە، بدرەوشێوە، ئەستێرە بچکۆلەکە
من چۆن بزانم کە تۆ چۆنی
* * *
کاتێک کاروانەکان لە تاریکیدا
سوپاست دەکەن بۆ ئەو رووناکییە بچووکەت
ناتوانن ببینن و بۆ کوێ بڕۆن
گەر تۆ نەبریسکێیتەوە
بدرەوشێوە، بدرەوشێوە، ئەستێرە بچکۆلەکە
من چۆن بزانم کە تۆ چۆنی
* * *
لە ئاسمانی شینی تاریکدا خۆت بپارێزە
کاتێ کە تۆ لە پەنجەرەکەمەوە دەزیقێنیت
تۆ هەرگیز چاوەکانت نانووقێنیت
تا خۆر لە ئاسماندا بێت
بدرەوشێوە، بدرەوشێوە، ئەستێرە بچکۆلەکە
من چۆن بزانم کە تۆ چۆنی

<u>لای لایەیەکی سویدی (بنوو کوڕیەکەم):</u>

بنوو کوڕیەکەم ، بنوو هاوڕێکەم
بەیانی دووبارە رۆژ هەڵدێت
کەس ناتوانێت نازارت بدات
من لێرەم و پاسەوانیت دەکەم
ریما، ریما گەوهەرە بچکۆلەکەم
ئەستێرەکانیش لە شەودا دەرەوشێنەوە

گۆلەکـان بە هـێواشی دەلەرێنـەوە
گیـایەکـانیش نووسـتوون

## لای لایەکی تری سویدی:

بنـوە ، بنـوە کـورپـەکەم
بنـوە ، بنـوە کـورپـەکەم
گەر نەنوێت جاڵجاڵۆکەکە دێت دەتبات
گەر نەنوێت جاڵجاڵۆکەکە دێت دەتبات
دایە دەڕوات جلەکان بشوات
بابە دەچـێت تـەوڕ دابنێت
گەر نەنوێت جاڵجاڵۆکەکە دێت دەتبات
گەر نەنوێت جاڵجاڵۆکەکە دێت دەتبات
جاڵجاڵۆکە بچکۆلەکەم لەماڵەکەدا بنوە

## لای لایەکی پورتوگالی:

ئـەی پیـاوە تـارمـاییەکە، دوورکـەوە
ئەو کەسەی لە سەربـانی خـانووەکەیت
لە کوڕەکـەم بگـەڕێ بـا بنـوێت
خـەوێـکی نـارام
لە کوڕەکـەم بگـەڕێ بـا بنـوێت
خـەوێـکی نـارام
* * *
کـوڕە بچـکۆلەکەم نـووسـتووە
خـەنـدەی لە لـێوە و خـەون دەبینێت

باز مەدەو هاوار مەکە
بۆ ئەوەی کورەکەم هەڵنەستێت

<u>لای لایەیەکی یۆنانی</u>

(دەنگە دەنگ مەکە.. کورپەکەم دەخەوێت)

دەنگە دەنگ مەکە
کورپەکەم دەخەوێت
لای لایە ، لای لایە
(نانی، نانی، نانی، نانی)
هەموو نازارەکانی سارێژ دەبن
خۆر لەسەر چیاکان دەخەوێت
کەویش لە کێڵگەدا
کورپەکەی من لە دووتوێی کەتانی سپیدا دەخەوێت
کەوەکە بنوە لە نێو دارەکانی چیادا
کورپەکەی من نووستووە، تا تێر خەو بێت
کورپەکەم دەخەوێت، حەزی لە ختووکەدانە
خۆراکی خەویش گوڵاوە
بە خۆشی لە خەو هەڵدەستێت
کێکێکیش بۆ رۆژی شاییەکەتە

<u>لای لایەی دایکێکی عەرەبی عێراقی</u>

(دللول.. دللول) هونەرمەندی کۆچکردووی عێراقی، خلتوو (وەحیدە خەلیل) لە رادیۆی بەغدا، بە ئاوازێکی

فۆلکلۆرییەوە، لای لەیەیەکی لەژێر ناوی (دللـول) دا، تۆمارکردووە.

لای لایە کورەکەم لای لایە
دوژمنەکەت دوورە و نیشتەجێی چۆلە
کوڕی دایە کوڕی دایە کوڕی دایە

بۆ گەورە فێلـمان لێی دەوێت
تا بتوانێت باری نەهامەتییەکان هەڵبگرێت
دوورکەوتنەوەی کوڕ دابڕانێکی گەورەیە
ئەی کوڕە گران بەهاکەم
کوڕی دایە کوڕی دایە کوڕی دایە
لە نیوە شەودا لە تەنیشتەمەوە
کەسێ لەخەو رات بچێنێت
وەرە باوەشی دایکـتەوە
ئەو کەسەش با بڕوات

<u>لای لایەیەکی هۆلەندی:</u>

لە میانەی پەنجەرەکەوە
مانگ دەبریسکێتەوە، مانگ دەبریسکێتەوە
تۆ دەزانیت ئەو دەیەوێت چی بڵێت؟
ناو ژوورەکە، زۆر نارامە، زۆر نارامە
ئایە بە راستی منداڵەکان لە جێگاکانیانن؟
یان هێشتا لە دەرەوە دان

مانگە جوانەکە، زۆر نزیک دەڕوانێت، دەبینێت
هەموویان لەسەر پەڕدا باڵکەوتوون
مانگ پێکەنی و پێکەنی، وتی: جوانە
هیوای شەونێکی خۆشی بۆ دەخوازم
بەیانی ڕۆژێکی تازە دێت
بۆ یاری و بۆ فێربوون
بەیانی ڕۆژێکی تازە دێت
بۆ یاری و بۆ فێربوون

لای لایەکی کرواتی:

بڕۆ بنوە کۆرپەکەم
بڕۆ بنوە گوڵەکەم
خەون ببینە باڵندەکەم
خەون ببینە، هیوادار بە

لای لایەکی یابانی:

باڵکەوە و بنوە، کۆرپەلەکەم، بنوە
خۆشەویستە بچکۆلەکەم، بنوە
لەسەر زەوییەکە خۆت بگەوزێنە و بنوە
ئەو ڕۆژەت لە بیرە کە دایەنەکەت

چوو بۆ زێدی خۆی لە چیاکانی باکوور
بیرکەوە لە زێدی خۆیەوە چی بۆ هێنای

<u>لای لایەکی تونسی:</u>

نـــەنی نـــەنی خـــــــوت نێت
دایکت مەتگە و باوکت نەستێرە
نـــــــەنی نـــــــەنی نـــــــەنی
خەونێـــکی خۆشـــت لێبکەوێـت

لە هەندێ دەقی تردا دێڕی یەکەم بەم جۆرەیە:

نـــەنی نـــەنی خـــــــوت نێت
دایکت زیـوە و باوکت مـــسە

<u>لای لایەکی سویسری:</u>

لای لایە لای لایـــە، کۆرپەکەم، بنـوە
مەڕەکان لە نێو گیایەکەدا دەلەوەڕێـن
چـــرا بچکۆلەکەش لـە هۆڵەکـەدایە
پەری یە بچکۆلەکەم خوا دەیپارێزێت
لای لایە لای لایـــە، کۆرپەکەم، بنـوە
* * *
بەرخۆلەیـــەکی جـــوانت دەدەمێ
چرایـــــەکی قنجیشــــت دەدەمێ
بەرخۆلە بچکۆلەکە خوا دەیپارێزێت

لانکەکەت رادەژێنم
لایە لایەت بۆ دەکەم

* * *

گۆزەیەک لە سەربان دایە
هەنگوینی خۆشی تێدایە
ژوورەکەمان چراخانە رووناکە
جێی خەویشت نەرم و پاکە
لای لایە لای لایە، کورپەکەم، بنوە

لای لایەکی عیبری:

وس، بێ دەنگ بە، بنوە
وس، بێ دەنگ بە، بنوە کچە کورپەلەکەم
باوکت رۆیی کاربکات
باوکت رۆیی.. رۆیی.. رۆیی
کە مانگ هەڵبێت دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ
دیارییەک بۆ کچە کورپەلەکەی دێنێت
وس.. بنوە
باوکت رۆیی بۆ رەزەکە
باوکت رۆیی.. رۆیی.. رۆیی
کە ئەستێرەکان هەڵبێن
دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ
تری بۆ خونچەگوڵەکەی دەهێنێت
وس.. بنوە.. بنوە

لای لایەکی فەرەنسی:

لە نووسینی هۆنراونووس: یۆهان فەردریک ریشارد.

بنوه کورپەکەم، چاوەکانت لێکنێ
گریانت دڵم دەتەزێنێت
بنوه کورپەکەم
دایکە کڵۆڵەکەت خەمی هێندە زۆرە بەسێتی
باوکت نوقمی خۆشەویستی کردم
بڕوام پێی کرد
چووە دڵمەوە
وەکوو تۆ بێ تاوان و باش بوو
بڕوام پێی کرد
ئەی ئەمڕۆ کوا بەڵێنەکانی
من و کورپەکەی لە یادکردووە
بنوه کوڕەکەم

<u>لای لایەیەکی ئیسپانی:</u>

لە دانانی مۆزیکژەن: مانۆییل دی ڤالا:

بنوه کورپەکەم، ئێستا بنوه
بنوه خۆشەویستی دڵم
بنوه ئەی ئەستێرە بچکۆلەکەی بەیانم
وەسبە.. ئەی بچکۆلەکەم
وەسبە.. خۆشەویستی دڵم
ئێستا بنوه
ئەی ئەستێرە بچکۆلەکەی بەیانم

## لای لایەیەکی تری ئیسپانی:

باڵـــندە بچکـــۆلـەکە

تۆ لە رۆخی دەریاچە روونەکەدا دەخوێنیت
کورپـــەکەم لـە لانــک دایە هەڵی نەسێنیت
دەی بێدەنـــــگ بـە ، لای لایــە ، لای لایــە
دەی بێدەنـــــگ بـە ، لای لایــە ، لای لایــە
بـــڕۆ بنـــوە نەســتێرە بچکــــــــۆلەکەم
نەســتێرە بچکـــۆلەکەی بەری بەیـــان

باڵـــندە بچکـــۆلـەکە

تـۆ لـە بەهـــــارێکی خۆشـــدا دەخـــوێنیت
بێدەنـــگ بـە ، کورپـــەکەم هـەڵـنەسێنیت
دەی بێدەنـــگ بـە ، لای لایــە ، لای لایــە
دەی بێدەنـــگ بـە ، لای لایــە ، لای لایــە
بـــڕۆ بنـــوە نەســتێرە بچکـــــۆلـەکـەم
نەســتێرە بچکـــۆلەکەی بـەری بەیـــان
لای لایــــە ، بێـــدەنــــــگ ، لای لایـــە
کورپەکەم خەوتووە و چاوەکانی کراونەتەوە
هـەر وەکو چـــــاوەکـانی کەروێشــــــک
دەی بێدەنـــگ بـە ، لای لایـــە لای لایـــە
دەی بێدەنـــگ بـە ، لای لایــە لای لایـــە
بـــڕۆ بنـــوە نەســـتێرە بچـــــــۆلـەکەم
نەســـتێرە بچکـــۆلـەکەی بـەری بەیـــان

## لای لایەیەکی فارسی (لالا ، لالا)

لای لایــە کورپـــەکەم لای لایــە
کورپـەکەم لای پەنجــەرەکە دایــە

باوكت چووه راوبكلت
دايكت چووه كاربكلت
بنوه كورپەلەكەی دايە
كورپەكەم لە لانك دايە
لانكی لە زێر دروست كراوە
بە مرواريش رازێنراوە
لای لایە كورپەكەم لای لایە

## لای لايەمكي رووسي (لوولي.. لوولي)

لوولی.. لوولی.. لوولينكی
لای لایە.. لای لایە.. لای لایە
كورە بچكۆلەم خەوی نايە
لە كوێی كوترە بچكۆلەكەم
وەرە لەسەر جێگاكەی بنیشەوە
بۆ كورە بچكۆلەكەم بخوێنە
وەرە كۆترە بچكۆلەكەم
لەوێ لە لای سەری دابنیشە
وی وی بنوە كورە بچكۆلەكەم

## لای لايەمكي تری رووسي:

پش، پشیلە، بچكۆلەكە
كەمێك كلكە بۆرەكەت بلەقێنە
وەرە شەو لێرە بمێنەوە
كورپە بچكۆلەكەم رازێنە

من پشـــــــيلەيەكت دەدمـــێ
نيشـــــــەكانت بۆ بكـــــــات
لەگـــەڵ كەمۆلـــەيەك شـــير

<u>لای لايەيەكی پۆلـۆنی:</u>

شـەوێـكی شـاد ، بێـدەنـگ
بنـــوە تـا بەيـــــانی دێـت
بنـوە كۆرپـەكەم ، چاوەكـانت لێكنـێ
بنـــوە تـا گـزنـــگ دەدات
دايــكت لـێرە لات دەبـێت
لای لايـــــــەت بـۆ دەڵـێت
دايــكت لـێرە لات دەبـێت
لای لايـــــــەت بـۆ دەڵـێت
ئەستێرەكان دەدرەوشێنەوە
منداڵان هەموو نووستوون
بۆيـە دەبێت تۆش چاوەكانت لێكبنێی
بنـــوە تـا گـزنـــگ دەدات
سبەينێ جارێكی تر لە بەيـانی زوودا
رۆژ هەڵــــدێت و هەڵت دەسێنێت
سبەينێ جارێكی تر لە بەيـانی زوودا
رۆژ هەڵــــدێت و هەڵت دەسێنێت

## لای لایەیەکی فەرەنسی

**(خوشکێک برا بچکۆلەکەی دەنوێنێت):**

بڕۆ بنوە، نیکۆلاس، برا بچکۆلەکەم
بڕۆ بنوە
شیرەکەی خۆت بخۆرەوە
دایە لە نهۆمی سەرەوەدا
هەندێ کێکمان بۆ دەکات
بابە لە نهۆمی ژێرەوەدا
کاکاوی گەرم دەکات
بڕۆ بنوە، نیکۆلاس، برا بچکۆلەکەم
بڕۆ بنوە
شیرەکەی خۆت بخۆرەوە

لای لایەیەکی تری فەرەنسی کە لە فەرەنسەدا بڵاو و بەناوبانگە:

لای لایە ، کۆرپەکەم ، لای لایە
لای لایە ، کۆرپەکەم ، لای لایە
کۆرپەکەم هەر ئێستا دەچێت بنوێت
لای لایە ، کۆرپەکەم ، لای لایە
کۆرپەکەم دوای کەمێکی تر دەنوێت
مریشکە سپییەکە لە کولانەکەی دایە
هێلکەیەک دەکات
بۆ کۆرپەکەم، کە دەیەوێت بنوێت
لای لایە، کۆرپەکەم ، لای لایە
کۆرپەکەم هەر ئێستا دەچێت بنوێت
لای لایە ، کۆرپەکەم ، لای لایە

کۆرپەکەم دوای کەمێکی تر دەنوێت
هەموو باڵشن لە گەرمەک دا
کاتی نەوەیە کە بچێت بنوێت
بە زۆترین کات دەبێت بنوێت

## <u>لای لایەیەکی هیندی:</u>

بنوە، کۆرپەکەم، بنوە
کەرێ و نان و شەکرە
کەرێ و نان نەماون
بنوە کۆرپەکەم
کۆرپە بچکۆلەکەم چوو بنوێت

## لای لایەیەکی تری هیندی:

وەرە دایکە، وەرە دایکە جوانەکەم
بەسەر گرەکەدا وەرە
ملیۆنێک گوڵ لەگەڵ خۆت بێنە
بە سواری گالیسکەکە وەرە
شتی جوان لەگەڵ خۆت بێنە
بەسەر جۆگەلەکەدا وەرە
شانەیەک هەنگوین بێنە
بە سواری گوێدرێژەکە وەرە
نارد و کارتێک بێنە
لە لای باغەکەوە وەرە
میوەی تازە بهێنە

گوێم لێبگرە و لێرە بیان پارێزە
هەموو ئەمانە بۆ کۆرپە جوانەکەت بهێنە

## لای لایەکی بولگاری:

کاڵینە لانک رادەژێنێت
لە سێبەری باخچەکەدا
کاڵینە لانک رادەژێنێت
پاکیزەیەکی جوان
گۆرانیبێژێک لە ئێوارەدا
لانکەکە رادەژێنێت
کاڵینە گۆرانی دەڵێت
لای لایە، لای لایە، براکەم
بنوە برا بچکۆلەکەم
خەو داوات لێدەکات
ناتوانیت گوێت لێیبێت
خۆشەویستەکەم ئەو دێت و
ئەمانەت پێدەبەخشێت
سێ کورتە باڵا پێشدەکەون
پشیلەیەکی جوان
چەند ئەسپێکی باڵ سپی
دێن بۆ...... دڵی من!

## لای لایەیەکی ئیتالی:

بــڕۆ بنــوە ، بــڕۆ بنــوە
لـە نــامــێزی دایـــکتدا
بــڕۆ بنــوە منـداڵە خۆشەویستەکە
بــڕۆ بنــوە ، بــڕۆ بنــوە
لـە نــامــێزی دایـــکتدا

## لای لایەیەکی هەنگاری:

شـــــەو هــــــات و تاریـــک بـــوو
کەروێشکەکە گوێیەکانی شۆڕبوونەتەوە
پشـــــــیلەکە پرخـــــە پـرخــــێتی
تـۆش بــڕۆ بخـــەوە منـداڵە بچکـۆلەکە

## لای لایەیەکی بەلچیکی:

بنــوە ، کوڕیــەکەم ، بنــوە
چاوەکــــــانت بنووقـــــێنە
نـابێت درۆ بــــــــــکەیت
چونــکە ناتــوانیت بنــوویت
بنــوە ، کوڕیــەکەم ، بنــوە

## لای لایەیەکی کەنەدی:

بنــوە ، کــوڕپــــــەلەکەم
بنــوە ، کــوڕپـــــەلەکەم
بنــوە ، کوڕپە جوانـەکەم
بنــوە ، بنــوە
کــوڕپـــــە جـــــوانـەکەم
سبەینێ ، گەر خۆشـبێت
دەچـــین بـاپــیرە ببینین
بنــوە ، بنــوە کــوڕپــەکەم
بنــوە ، بنــوە کــوڕپــەکەم

## لای لایەیەکی سلۆڤـاکی:

شـــەو شـــاد
شــەو شــاد ، خۆشــەویستەکەم
شــەو شــاد ، جگـــەرگۆشەکەم
شــەو شــاد ، خـەونێـکی خـۆش
خەونێکی خۆشـت بۆ دەخـوازم
شــەو شــاد ، خۆشــەویستەکەم
شـــەو شـــاد
خـــــودا خـــۆی نـاگـــای لـێتە
شــەو شــاد ، خـەونێـکی خـۆش
خەونی خۆشی خەونەکان ببینە!

## لای لایەیەکی دانیمارکی

وسبە کۆرپەی بچکۆلەکەم
دایکت بەنەکە گلۆڵە دەکات
باوکت چووە بۆ لۆنگبریگە
بۆ کۆرپەکەی پێڵاوی تازە بکڕێت
پێڵاوی تازە دەبریقێتەوە
ئەوسا کۆرپەکەم تێر دەنوێت

## لای لایەیەکی مەغریبی:

بنوە کۆرپەکەم
تا خواردن پێ دەگات
گەر خوانەکەی خۆمان پێ نەگات
خواردنی دراوسێکەمان پێ دەگات
بنوە کۆرپەکەم تا دایکت دێتەوە
خواردن لەسەر خوان دادەنرێت
شیرینیش دەخرێتە سەر سینی

## لای لایەیەکی کەتەلۆنی:

مریەمی پاکیزە
کە ببێت بە منداڵ
دەچێت بۆ قوتابخانە
تا فێری نووسین بێت
زەمیلەیەکی بچووک دێنێت

لەگەڵ چوار سنیوی بچووک
لەگـــەڵ پارچـــــە نانـێک
هەروەهـــا کەمـــێک گوێـز

<u>لای لایەیەکی یابـــانی:</u>

کەنـــاری دەخـوێنێت
لای لایـــە دەکـــات
بنـــــوە .. بنـــــوە
بنـــــوە .. بنـــــوە
لەســـەر لانکـــەکەدا
بەری هەنجیرەکە دەلەرێنمەوە
بنـــــوە .. بنـــــوە
بنـــــوە .. بنـــــوە
ســــمۆرەکە هەڵـــــدەپەرێت
دەســـرازەکە بە لانکـــەکەوەیە
بنـــــوە .. بنـــــوە
بنـــــوە .. بنـــــوە
لەگەڵ تـریفەی مانـگی زیوینـدا
لە نێو لانکەکەدا خەون ببینە
بنـــــوە .. بنـــــوە
بنـــــوە .. بنـــــوە

## لای لایەیەکی چینی:

لای لایــــە.. لای لایــــە
دایــک دڵســۆزتـرین کەسە لە جیهانـدا
دایکت بۆ تـۆ بەهـاترین گەنجیــنەیە
خـۆت هـەڵـــــدە نــاو دڵـی دایـکتەوە
تـۆ شـــــــادیی لـێ دەدۆزیـــــــتەوە
لای لایــــە.. لای لایــــە
دایـک دڵسـۆزتـرین کەسـە لە جیهانـدا
بەبێ دایکت تۆ وەکوو پووشێـک وایت
دوور لـە دڵـــی دایـکت
لـە کــوێ شـــادی دەدۆزیـــــتەوە؟

# کۆکردنەوە و نووسینەوەی لای لایەی کوردی

پێشتر باسمان کرد، کە لای لایە بەشێکە لە نەدەبی منداڵان و لە فۆلکلۆر و لە کەلەپووری رەسەنی کوردیمان. سوودێکی زۆری دەروونی و جەستەیی و پەروەردەیی و فێرکردنی بۆ منداڵان هەیە. لای لایە گوزارشتە لە سۆز و خۆشەویستی و میهرەبانی دایکان، رەنگدانەوەی خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانن. گوزارشتن لە دوخ و گوزەران و لە باری دەروونی و کۆمەڵایەتی دایکان، لە کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی کە تێیدا ژیاون.

سەردەم گۆڕاوە، لە ئەمڕۆدا بەشێکی زۆری دایکان، بە هۆی کارکردنیان لە دەرەوەی ماڵدا، هێندە ناپەرژێنە سەر کورپەکانیان، تا زیاتر بایەخ بە پەروەردەکردنیان بدەن و خۆشی و شادییەکی زیاتریان بۆ دابین بکەن و کاتێکی زیاتر لەگەڵ کورپەکانیاندا بمیننەوە. دایەنەکانیش ناتوانن جێی سۆز و خۆشەویستی و دڵسۆزانی دایکان پڕکەنەوە.

لایەکی تریشەوە، شۆرشی تەکنۆلۆژیا و داهێنانی شتی سەیر و سەمەرەی سەرنج ڕاکێشی بابەتی یاری و خافڵاندنی منداڵان، خەریکە تەنگ بە لای لایە و گۆرانییەکانی دایکان هەڵبچنن.. ئەرکی زیندووکردنەوە و درێژەدان بە لای لایە و بە گۆرانییەکانی دایکان تەنها ئەرکی دایکان نییە، ئەرکی نووسەران و فۆلکلۆرخوازانیشە کە لای لایەی دایکانی کوردمان بە هەموو دیالێکتەکانی کوردی، لە هەموو ناوچەکانی کوردستان دا کۆیان بکەنەوە و بیانووسینەوە و بە وردیش لە لایەن کەسانی شارەزاوە توێژینەوەیان لەسەر بکەن و بیانکەن بە پەرتووک و چاپیان بکەن و

بلاویان بکەنەوە و پێشکەشی دایاکانی ئەمڕۆمانیان بکەن.. ئەرکی ئاوازدانەرەکان و موزیکژەنەکانیشە، کە ئاواز بۆ لای یەکان دابنێن، گۆرانیبێژەکانیشمان، بە تایبەتیش خانمە هونەرمەندەکانمان بە سەدای ناسک و شیرینیان تۆماریان بکەن، تا لە بیرچوونەوە رزگاریان بکەین.

سەرقاڵبوونی دایکانی ئەمڕۆمان بە کارکردنەوە، نابێت ببێت بە پاساو و بیانوو بۆ لە بیرکردنی لای لایە، چونکە ئەوان رۆڵێکی گرنگیان هەیە لە زیندووکردنەوە و لە درێژەپێدان و لە پاراستنی لای لایە و لووری و گۆرانییەکانی تایبەت بە خەواندنی منداڵەکانیان. دەشتوانن لای لایە و گۆرانیی نوێش بۆ منداڵەکانیان دابنێن.. چڕینی لای لایە و گۆرانیی تایبەت بە منداڵان، بە دەنگی پڕ لە سۆز و نەرم و شیرینی دایکان، خۆشی و گەشی و چێژ و سوودێکی زیاتر بە کۆرپەکانیان دەبەخشن.

راستە کە کۆکردنەوە و نووسینەوەی لای لایە و لوورین و گۆرانییەکانی دایکان بۆ منداڵا ن، کارێکی هێندە ئاسان و هەرەمەکی نییە، سەرەڕای دڵسۆزی پێویستی بە شارەزایی و بە سەرنج وردی و خۆماندووکردن هەیە.. ئاسان نییە کە بە هەموو دیالێکتەکان و بەش و لقە دیالێکتەکانی زمانی کوردی و لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی فراواندا، بە کەسێک و دووان کۆبکرێنەوە و بنووسرێنەوە. کۆکردنەوەی لای لایە ئەرکێکی پێویست و پیرۆزی نیشتمانیمانە، کە بە هەوڵ و بە هاوکاریی نووسەران و کەسانی دڵسۆز هەیە، تا بتوانین بەشی هەرە زۆریان کۆبکەینەوە لە بیرچوونەوە و لەناوچوون رزگاریان بکەین.

گەشبــینم کە بە هــەوڵ و تێکۆشـــان و هاوکـــاری و کۆڵـــنەدانی دڵسۆزانی گەلەکەمـان، لە سـایەی بـڕوا و وپـست و سووربوونـــدا، ئەستەم بـوونی نییە، ئەوەی بەڵەمەوێت دێتـەدی.

بە پێویستیشی دەزانین کە لای لایـە و گۆرانییەکانی دایکـان، تـایبەت بە منداڵان، بخرێنە پـرۆگرامـە پـەروەردەییەکـانـەوە، بـە تـایبـەتـیش لـــە قۆنـــاغی قوتـابخـــانەی بنـەرەتیـــدا، بە مەرجـــێک لەگـــەڵ پێداویستییەکانی ئـەم سەردەمـەدا بگونجـێن، تـا بـبن بە پـردێـکی بەیەکگەیـانـدن لـە نێوان رابـردوو و ئـەمڕۆ و داهـاتوودا.

هیواداریـشـم ئـــەم چەپـەکە لای لایەیــانە و لـوریـــن و گـۆرگـــانە شـەوی و گـۆرانییـانەی دایکـانی کوردمان و دایکانی گـەلانی تری جیهان بـۆ کورپەکـانیان، کە ئەم پەرتـووکەم لە نامـیزی کـردوون.. جێی پێخـۆشحاڵیی دایکـانی کوردمـان و هـەوادارانی لای لایـە و خوێنـەرانی دڵسـۆزمـان بـن.. بشبێت بە سەرچـاوەیـەک بـۆ سـوود لێوەرگـرتـن.

گەر لە رووی دارایـیـــەوە یـــا دەزگــــایەکی چاپکـــردنی پەرتـــووک یارمـــەتیمی بـــدایە، بەشـێک لە لای لایـەکـــان، بە دەنگـــی خـــودی هـونەرمەنـــدان و دایکـان، لەسـەر سـیدییەک تـۆمـــارم دەکـــردن و لەگەڵ ئەم پەرتووکـەدا دام دەنـا، بایـەخێکی زیاتـری بەم پەرتـووکەم دەدا و سـوودێــکی زیـاتـریـشی بـــە خوێنــەرانی خـۆشـەویـستمان دەبـەخـشـین.

داوی لێبـووردنیش دەکـــەم، کە هـــیچ لای لایەیەک یـــا لـــورینێکی رۆژئـاوای کوردستانی تێـدا نییە.. پەیوەنـــدیم بە زیـــاتر لە هەشـــت خوشـک و بـــرای کـوردی رۆژئـــاوای کوردسـتانەوە کــرد، بەڵام

نەیانتوانی لورینێکم بۆ وەربگرن. کە حەزم دەکرد کە لەم پەرتووکەدا بوایە.

پــڕ بــە دڵــیش هیواخــوازم، کە کەســانی شــارەزا و دڵــسۆز، نــاوزەنــگی لــە نەســیی توانــا و شارەزاییــان لــەم بــوارەدا بــدەن.. ئەوانیــش لــە گــوڵــزاری رەنگــین و بەرینــی لای لایــە و لــورین و گۆرانییەکــانی دایکــانی کــوردمــان، چەنــد چەپکێکی تــری لای لایــە و لــورین و گــۆرانییەکــانی دایکــانــمان بــۆ منــداڵانی کــوردمــان، چەپکبەســت بکــەن، بیــیان خــەنە ســەر خەرمــانی ئــەدەب و رۆشــنبــیریی منــداڵانی کــوردمــان و فــۆلکلــۆری کــوردیمــان.

رەمزا شــوان

نەرویــج : ٢٥/ ٥/٢٠١٩

# سەرچاوەکان

زۆر یا کەم سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتوون.

**سەرچاوە کوردییەکان:**


١ـ سەرەتایەک دەربارەی سەرهەڵدانی ئەدەبی منداڵان. نووسینی : ناهیدە ئەحمەد. چاپی یەکەم ـ هەولێر : ٢٠٠٥

٢ـ پەیجی لای لایەی دایکانی کورد : فەیسبووک. لای لایە بە زمانی کوردی

٣ـ لای لایە بە زمانی کوردی (ناڤێستا) : پرۆفیسۆر فاروق سەفی زادە (بۆرەکەیی) گۆڤاری مانگانەی (ئاناهیتا ـ ژمارە ـ ٥ )

٤ـ چاوپێخشاندنێک بە مێژووی ئەدەبی منداڵان ـ نووسینی : رەمزا شوان چاپی یەکەم ـ کەرکووک : ٢٠١٥

٥ـ لایلایەی دایکانی کورد ـ کۆکردنەوەی: هاشم سەلیمی و عوسمان محەممەد هەورامی سلێمانی ـ چاپی یەکەم :٢٠٠٥

٦ـ ئەدەبی منداڵانی کورد ـ بەرگی یەکەم ـ حەمە کەریم هەورامی ـ هەولێر : ٢٠٠٥

٧ـ لای لایە تەنیا گۆرانییەک کە گۆرانی بە خۆوە ئەدی ـ فەردین کەمانگەر سایتی کوردیا : ٢٣ی/ نۆڤەمبەر / ٢٠١٢

٨ـ پێگەی ئەدەبی منداڵان لە رۆژهەڵاتی کوردستان ـ شەریف فەلاح ـ ژوانگەی ئەدەب.

٩ـ لای لایـەی دایکـانی کورد  ـ هەوینـی هـەستی نەتەوایـەتی  ـ یوسـف قـەدیـری سـایتی کوردسـتان و کـورد : ٢ی/ ئاوگـوست/ ٢٠١٢

١٠ـ گولبژێـرێک لە وتەکـانی نـاودارانی جیهـان  ـ رەمزا شـوان  ـ کەرکووک : ٢٠١٢

١١ـ ژنـی کـورد، گواسـتنەوەی زمــان و ناسـنامە  ـ بەرهەنگـاری ژینوسایـد  ـ پشکنینێک لەسـەر خـوێندنە هـارمۆنییەکـان  ـ خاتـوو : سورمیـــا فــەلاح و کـــلارا مورادیـــان وتـــارێکە لە ســـێیەمین کۆنفرانسی سالانـەی ژنـانی کـورد  ـ رۆژهەڵاتـی کوردستان، لە بەرواری (٢ی/ نۆڤەمبەر/٢٠١٣) لە لەندەن. پێشکەشـیان کـرد.

١٢ـ مـافی ئـافرەت لە نێوان رەگەز سـالاری و مرۆڤسالاریی دا  ـ عومەر عەلی غەفور چاپی یەکەم ـ هەولـێر : ١٩٧٧

١٣ـ لای لایـە بە دیـالێکتی کەلهـوری  ـ عـەبـاس جەلیلیان (نــاکۆ) پەیجـی دایکـانی کورد : ٨ی/دیسەمبەر/ ٢٠١٣

١٤ـ هـەرمـانێک لە پەراوێـز ژیــان ـ بـەرگی یەکـەم : جیهـانـفەرد
١٥ـ ژنـە جـافێک لە کەلارەوە ـ حەبیە خـانمی کەریم بەگـی جـاف : ئەحمـەد بـاوەڕ گۆڤـاری شیکار ـ ژمـارە ـ ٢٤ی سالی : ٢٠١٨

١٦ـ مـرگ انـدیشی در لالاییـهای کـردی ـ مـریـمم پـارسـا

١٧ـ کێ گورگـەکەی گورگـانە شـەوی لەبـیرە؟ پەیـجی لای لایـەی دایکـانی کورد

١٨ـ نەرمـۆلە  ـ هۆنـراوە بـۆ منـدالان  ـ محـەممەد ئینسافجویی (نەهـۆمن) چـاپی یەکـەم : ٢٠٠٤

١٩ـ یادی بەخێر ـ گۆرانییەکانی محەمەد مامەلێ ـ کۆکردنەوەی : هیوا قارەمانی چاپی یەکەم ـ چاپخانەی مەهاباد : ١٩٩٩

٢٠ـ لای لایەی سەربێشکە ـ هێنریک نۆرد برانت وەرگێڕانی بۆ کوردی : نالان پەری

٢١ـ لای لایەی دایکان ـ ساباتی سوز : ٢٠١٣

٢٢ـ لاوە لاوە ـ کۆکردنەوەی ـ سوهراب مرادی ـ ماڵپەری هەسارە

٢٣ـ چەند بەیت لاوە لاوەی ناوچەی کەڵهوڕ کۆکردنەوەی ـ ژیار جەهانفەرد ـ ماڵپەری هەسارە.

٢٤ـ یاری لە کوردەواریدا ـ دوکتورە نەسرین فەخری بەرگی سێیەم ـ سلێمانی : ٢٠٠٥

٢٥ـ گۆرانی و فۆلکلۆری کوردی ـ کۆکردنەوەی: ناسر ئەحمەدی و جاسم محەمەدی

٢٦ـ لای لایەی (حەمە خانی کەریم بەگ) بۆ سەرکەوتی کوڕی ـ سایتی ناڵەکۆک

٢٧ـ لاوە لاوەی دالگەیل نیلامی ـ ماڵپەری هەسارە

٢٨ـ دیوانی شاعیر هەژار موکریانی (بۆ کوردستان)

٢٩ـ دیوانی شاعیر فایق بێکەس

٣٠ـ دیوانی شاعیر قانع

٣١ـ دیوانی مینە جاف ـ کۆکردنەوە و رێکخستنی ـ مستەفا نەریمان ـ بەغدا : ١٩٩٠

٣٢ـ دیالێکتەکانی زمانی کوردیی ـ دکتۆر حوسێن محەممەد عەزیز سایتی وتاری کورد: ٢٠١٨/٢/١٦

٣٣ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ بەرگی دووەم ـ سدیق بۆرەکەیی (سەفی زادە) هەولێر : ٢٠٠٨

٣٤ـ ئەدەبی منداڵان ـ بە سەرپەرشتی : سەعدوڵلا شێخانی ـ هەولێر.

٣٥ـ خەرمانلوغە ـ شیعر بۆ منداڵان ـ دکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان ـ هەولێر:١٩٨٥

٣٦ـ ئەدەبی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژدا ـ ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی ـ هەولێر:٢٠٠٥

<u>**سەرچاوە عەرەبییەکان:**</u>

١ـ لانک (مهد الطفل الكردي) ـ دكتور جمشيد ابراهيم الحوار المتمدن : ١٥/٨/ ٢٠١٢

٢ـ ترانيم الاطفال واغاني الامهات، دللول العراقية، ذات اصول كرديه مشتركه مع الانگليزيه ـ دكتور مويد عبدالستار ـ موقع كلكامش : ٥ى/ نوڤەمبەر/ ٢٠٠٧

٣ـ ترانيم الامهات العراقيات في تنويمة الابناء، دكتور علي السعدي :١٦/مايس/ ٢٠١٦

٤ـ اهازيج الهدهدة للاطفال ـ محمد ابو العزائم ابو الريش : ٢٠٠٦

٥ـ ترانيم المهد في التراث الشعبي ـ هند يوسف السامراني ـ موقع مركز النور :٢٠١١

٦ـ اهازيج الامهات تساعد على الخلود الى النوم ـ سوزان العامري موقع الامارات : ٢١ /نيسان/ ٢٠١٨

٧ـ ترانيم الامهات يعبر عن عواطف الام ـ اسماعيل النجم ـ موقع ديرالزور : ٢٠١١

٨ـ اغاني هدهدة الطفل موروث شعبي ـ سهير عبدالحميد : ٢٠٠٢

٩ـ اغاني المهد ترنيمة الامهات منذ آلاف الاعوام ـ دكتور محمد الجوبلي صحيفة العرب : ١٧/أب/٢٠١٥

١٠ـ اغاني ترقيص الامهات عند العرب ـ احمد ابو سعد : ١٩٧٤

١١ـ غناء الام لطفلها ناقص النمو يساعد على سرعة التعافي ـ موقع الاخبار : ٢٠١٣

**سەرچاوەی ئینگلیزی:**

1-Lullabies Around The world – A Mama Lisa Book.

2-Vocalist is the word,s leading lullaby singer - Amy Robbins Wilson

**سەرچاوەی نەرویجی:**

ILLUSRT A

Barnest første bok

Kari og Werner Grossmann – 2005

**سەرچاوەی سویدی:**

Tussa lulla

VAGGvISOR FRÅN VARLDEN

Oversa av till Svenska:

Fngrid- Sanna Kallman – Anna Ottertun – Maria Stella

# سوپـاس و پـێزانین

سوپاس و پێزانینم بۆ ئەم برا دڵسۆزانە هەیە کە بە هەر شێوەیەک بێت یارمەتییان دام:

١ـ سوپاس و پێزانینم بۆ برای دڵسۆزم، نووسەر و رۆژنامەنووس و جواننووس کاک عەبدولستار جەباری لە کەرکووک، کە پەرتووکی لایلایەی دایکانی کوردی بۆ ناردم.

٢ـ سوپاس و پێزانینم بۆ برای دڵسۆز، نووسەر و هونەرمەند کاک ریژەن حەسەن لە سلێمانی لە ئەنیستیتۆی کۆمپیووتەری کورد، لانکۆلەکەی کاک ئەسر رەمزازی بۆ ناردم.

٣ـ سوپاس و پێزانینم بۆ برایانی (مطبەندی هونەری مامەلێ) بە تایبەتیش بۆ برای دڵسۆز کاک وریا مامەلێ، دەقی لانکۆلەکەی هونەرمەند محەممەد مامەلێ یان بۆ ناردم.

٤ـ سوپاس و پێزانینم بۆ خاتوو (هێرۆ جەلال سەعید) لە ستۆکهۆلم لە سوید، کە لە وەرگێرانی دوو دەقی لای لایەی سویدی بۆ سەر زمانی کوردی یارمەتیی دام.

٥ـ سوپاس و پێزانینم بۆ ئەم برا دڵسۆزانەم، کە هەریەکە بە شێوەیەک یارمەتییان دام:

مامۆستا عەلی سالح عەلی، کاک لوقمان مەجید عەزیم، کاک حەمید شوانی، دوکتۆر دڵشاد شوانی. هیوادارم لە نموونەی دڵسۆزییان زیاتر بن.

٦ـ سوپاس و پێزانینم بۆ برای دڵسۆزم، شاعیر کاک (نەیاز خوون سیلوەشان) لە شاری بێرگن لە نەرویج، کە دەقی لای لایەیەکی فارسی بۆ وەرگێرام بۆ کوردی.



پەرتووکە چاپکراوەکانی نووسەر:

١ـ هەڵمەتی ـ چیرۆک بۆ منداڵان ـ بەغدا : ١٩٧٠

٢ـ گوڵبژێرێک لە وتەکانی ناودارانی جیهان ـ کەرکووک : ٢٠١٢

٣ـ سروودی من ـ هۆنراوە بۆ منداڵان : ٢٠١٢

٤ـ چاوپێخشانێک بە مێژووی ئەدەبی منداڵان ـ کەرکووک : ٢٠١٥

٥ـ ڕەنگەکان ـ چیرۆک بۆ منداڵان ـ کەرکووک : ٢٠١٩

٦ـ چەپکێک لە لای لایەی دایکانی کورد ـ کەرکووک : ٢٠١٩



## رەزا شوان

لە ساڵی ( ١٩٤٦ ) لە دێی ( گۆگجە ) لە ناوچەی ( شوان ) ی سەر بە پارێزگای ( کەرکوک ) لە دایکبووە.

- لە ساڵی ( ١٩٦٩تا ١٩٩٥) لە کەرکوک مامۆستا بووە .. لە ساڵی (٢٠٠٠ ـ ٢٠٠٢) لە شاری ( بیرگن - نەرویج ) مامۆستای ( زمانی دایک - کوردی ) بووە.

- لە ساڵی (٢٠٠٦) لە نەرویج ( کۆمەڵەی منداڵانی کورد) ی دامەزراندووە.

2019

چاپی یەکەم